# باڵندەکەی من

## فەریبا وەفی


- ناوی کتێب: باڵندەکەی من
- بابەت: ڕۆمان
- نووسەر: فەریبا وەفی
- تایپ: ڕزگار حەساری
- هەڵەچن: زنار محەمەد
- مونتاژ: یانەی قەڵەم
- بەرگ: جەبار سابیر
- تیراژ: (500) دانە
- چاپ: یەکەم (2011)
- چاپخانە: یاد، بازاڕی سۆز–نهۆمی سێیەم
- نرخ: (3000) دینار
- لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (1845)ی ساڵی 2011 پێ دراوە.

فەریبا وەفی

# باڵندەکەی من

## رۆمان

براوەی خەڵاتی باشترین رۆمانی ساڵی 1381
سێیەمین خولی خەڵاتی هۆشەنگی گوڵشیری
دووەمین خولی خەڵاتی ئەدەبی یەڵدا

وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف

سلێمانی 2011

**لەچاپکراوەکانی پڕۆژەی کتێبی یانەی قەڵەم**
**زنجیرەی ژمارە (74)**

سەرپەرشتیاری پڕۆژە: جەبار سابیر
جێگری سەرپەرشتیار: ئارام سدیق

ناونیشان: یانەی قەڵەم، سلێمانی، سابونکەران، بینای هەورامان
نهۆمی سێهەم. ژمارەی تەلیفۆن: 07701575726

# لە جیاتی پێشەکی

و: حەمەکەریم عارف

شا قارەمانی ئەم رۆمانە ژنێکی گەنجە کە گوتیار(1) و شاقارەمانی(2) رۆمانەکەیەو رەنگە بتوانرێ بە ئاوێنەیەکی بالانمای ژیانی گەلێك لەو ژنە خوێنەوارانە دابنرێت کە بە دیدو بۆچوونێکی جیاواز لە ژنانی ئاسایی دەڕواننە دنیای دەوروبەری خۆیانو بە هۆشمەندیو هەستیارییەکی زۆرەوە مامەڵە دەگەڵ دۆزو کێشەکانی خۆیانو خەڵکی تردا دەکەن. جا ئەم ژنە گەنجە (شاقارەمانی رۆمانەکە) لەو روانگەیەوە شان دەداتە بەر ئەرکە سروشتیو کۆمەڵایەتیەکانی خۆیو رێك بە پێچەوانەی دوو کاراکتەری(3) تری رۆمانەکەوە (کە یەکێکیان شەهلایەو مل بۆ شووکردن نادات، ئەویتریان مهینە کە شووکردن بە فاکتەرو هۆیەك دەزانێ بۆ رزگار بوون لە کۆتو بەندی کەلتووری، مێژوویيو جوگرافی،) راستگۆیانەو یەکدڵ شوو بە پیاوێك دەکات کە بە هاوکوفو هاوبیری خۆی دەزانێت، و دەیەوێ بە حوکمی ئاوەزوو هەست، ئەم ئەرکە بە دروستیو بە تەواوەتی ئەنجام بدات.



هەڵبەتە گۆڕانی ئامانجە کۆمەڵایەتیەکانو وەزعو حاڵو رەوشی ناهەمواری کۆمەڵگای پاش شۆڕش، کە بنەماڵەکەی ئەویش دەگرێتەوە، هێندەی دی ئەنجامدانی ئەم ئەرکە قورسو دژوار دەکاتو نامیهرەبانیو ناسازگارییەکانی هاوسەرەکەی زیاتر و توندتر دەکات.

گوتیاری رۆمانی (باڵندەکەی من) هەوڵدەدات بەوپەڕی ناسکی و وریاییەوە رەفتار بکات و ئەرکی هاوسەرێتی ئەنجام بدات، بەڵام وردە وردە گلەیی و گازاندە دەبێ بە گەنگەشەو مشتو مڕ، مشت و مڕ دەبێ بە دادو بێدادو هاوار، هاواران دەبن بە قەرقەشەی بەردەوام،و ئەو هێشتاش دەخوازێ پابەندی ئەرکی هاوسەرێتی خۆی بێتو ناتوانێ وەکو مەنیجە، کە کاراکتەرێکی دیکەی رۆمانەکەیە، تەنیاییو بێزاریو نائومێدی خۆی لە ژیانی ژن و مێردایەتی، بەخیانەت لە مێردەکەی و دروستکردنی پەیوەندی دەگەڵ کەسێکی دیدا، چارەسەر بکات، بەرە بەرە لە ژنێکی بەهێزو ورە بەرزەوە، دەگۆڕێ بۆ ژنێکی تەنیاو خەمین و خەمبار لەودیو حەساری بێدەنگییەوە، پەنا وەبەر ژێر زەمینی یاد و بیرەوەرییە نەخوازراوەکان دەباتو هەستی مەغدوریەت و تووڕەیی بەڕادەیەك بەسەریا زاڵ دەبێ کاتێ کە بیر لە ژیانی خۆی دەکاتەوە، بەو تەوسەوە خۆی دەگەڵ جەعفەر ئەشقی لاتی گەڕەکدا لە تای یەك تەرازوودا دادەنێت.

نووسەر بۆ گوێزانەوەی زهینەتو هزرینو هەستەکانی گوتیار، سوودێکی زۆری لە تۆنی ساتیرئامێزی گوتیاری رۆمانەکە وەرگرتووە. رۆمانەکە لە گۆشەنیگای دەروونییەوە(4)و بە شێوەی گوتیاری- قارەمان دەگێردرێتەوە.

گوتیاری رۆمانی ناڤبری ژنێکی خوێنەواری سەر بە چینی مامناوەندییە، شووی بە ئەمیر ناوێك کردووە کە جۆرە هاوبەشییەکی فیکری و کۆمەڵایەتیان لە نێواندا هەیە. خاوەنی کورو کچێکن، ئەمیر بۆ دابینکردنی بژێوی خێزانەکەی لە هەوڵی کارکردنو بەدەستهێنانی دەرامەتی زیاتر دایە، ماوەیەك بۆ باکۆ دەڕوات، پارە بۆ منداڵەکانی دەنێرێتەوەو جار جاریش سەریان دەداتەوە. ژنە بە تەنیاو بە زەحمەتێکی زۆر منداڵەکان بەخێو دەکات. کە ئەمیر لە باکۆ دەگەڕێتەوە، خانوویەکی چکۆلە دەکڕنو خێزانەکە جۆرە ئارامی و ئاسوودەییەکی تێدەکەوێ.

ژیانی کەم دەرامەتی و یادگاری ژینگەو ژیانی جیاوازی هەندەران، ئەمیر دەخەنە سەر کەڵکەڵەی رۆیشتن بۆ کەنەدا، ژنە کە ساڵانی سەختی تەنیایی و دەستکورتی، ماندوویان کردووەو تا ڕادەیەك بەم وەزعە تازەیەیان رازییە، بە رۆیشتن بەرەو ئایندەی نادیار قاییل نیە، ئەم مەسەلەیە دەبێتە مایەی مشت و مڕی بەردەوامی ئەو و مێردەکەی و دوو منداڵە نۆلاوەکەی کە ئەوانیش هاوڕەئی باوکەکەیانن. ئەمیر بڕیار دەدات بۆ خەرجی سەفەر، خانووەکە بفرۆشێت و کاتێ رووبەڕووی نارەزایی ژنەکەی دەبێتەوە هەڕەشەی تەڵاقدانی لێدەکات. ژنە کە رووبەڕووی بڕیاری بنجبڕی مێردەکەی دەبێتەوەو توانای سەرپێچی نیە، خەمبارو تەنیا پەنا وەبەر دنیای هزرو زەینی مەیلەو نەخۆشی خۆی و ئەو پیلەی بێدەنگیەی کە لە دەوری خۆیی تەنیوە، دەبات.

***پەراوێز:***



1- گوتیار (راوی): ئەو کەسەیە کە چیرۆك، یان هەر شتێکی دی دەگێڕێتەوە، کە بۆی هەیە بەزارەکی یان بە نووسین بیگێڕێتەوە.

2- شاقارەمان: کەسێکە کە لە چەقو جەرگەی کارە چیرۆکڤانیەکەدایەو نووسەر هەوڵدەدا سەرنجی خوێنەرو وەرگری بۆ ڕابکێشێ.

3- کاراکتەر: کاراکتەر، یان قارەمان زادەی خوڵقاوی زەینو خەیاڵی نووسەرەو، ئەخلاقیاتو رەفتارو باری دەروونیان لە گوتارو کردەوەکانیان دا بەرجەستە دەکات.

4- گۆشەنیگا: هەر نووسەرە بە شێوەو شێوازێك کەرەستەو رەگەزە چیرۆکڤانیەکانی خۆی بە خوێنەر نیشان دەدات، پەیوەندی خۆی، واتە نووسەر بە چیرۆکەکەوە نیشان دەدات، ئەمە پێی دەگوترێ گۆشەنیگا، کە یان دەروونییە، یان بێروونی، لە گۆشەنیگای دەروونی دا، چیرۆکبێژ دەبێت بە یەکێك لە قارەمانانی چیرۆکەکەو، و چیرۆکەکە بە ڕاناوی یەکەم کەس دەگێڕدرێتەوە. ئەگەر گوتیار کاراکتەری سەرەکی چیرۆکەکە بێ گوتیاری –قارەمانی پێدەگوترێو ئەگەر کەسایەتی لاوەکی بێ گوتیاری- چاودێری پێدەگوترێ. لە گۆشەنیگای دەروونی دا سوود لە هەموو جۆرەکانی مەنەلۆگ وەردەگیرێت

***سەرچاوە:***

رمانهای معاصر فارسی (کتاب چهارم)
چاپ اول : زمستان385/انتشارات نیلوفر

# 1

ئێرە چینی کۆمۆنیست نیە. من وڵاتی چینم نەدیتووە، لێ هزر دەکەم دەبێ شوێنێك بێ وەکو گەڕەکەکەی ئێمە، نا، راستت دەوێ گەڕەکی ئێمە وەکو چینە، پڕە لە خەڵکی.

دەڵێن لە شەقامەکانی چیندا هیچ حەیوانێك بەرچاو ناکەوێ. تا چاو بڕ دەکات، تەمەشای هەر شوێنێ دەکەی تەنیا بەشەر دەبینی. بەم پێودانگە گەڕەکی ئێمە کەمێك لە چین باشترە، چونکە پشیلەیەکی هەرزەمان هەیە کە لەسەر گوێسەبانەی هەیوانەکە هەڵدەکورمێ،و هاوسێکەی قاتی سێیەمیشمان، توتی بەخێو دەکات. موغازەیەکی تەیر فرۆشیش لەسەری کۆڵانەکەدا هەیە.

کە هاتینە ئەم خانووە لێبڕام ئێرەم خۆش بوێ. ئەگەر ئەم بڕیارەم نەدابا، لەوەبوو هیچ کاتێك ڤیان و خۆشەویستیم بەلادا نەهاتبا. هەراو زەنا زۆر بوو، رۆژی یەکەم وەك بلێی بۆ زیاتر ئاشنابوونی ئێمە بەم ژینگە تازەیە، ئاغای هاشمی کچۆڵە چواردە ساڵانەکەی گرتە ژێر شەلاخ و قامچی و دەمڕێژێ جنێوی، کە هەڕەمەیەك بوو لە چەند زمانێك، وەکو زیخ و چەوی نێو حەوشە خامۆشەکەی ئێمە، بەسەردا هەڵڕشت.



دایکم دەڵێت گەڕەکەکەی ئێوە وەکو قوتوی عەتار وایە هەموو شتێکی تیا پەیدا دەبێت. راست دەکات. شەقامەکەمان پڕە لە نیعمەت. چەند نانەواخانەیەكو سەد دانە بەقاڵخانەی تیایە، کە لە سەرەتادا تیا مابووم شت لە کێیان بکڕم تا ئەویتریان زویر نەبێت، سەوزەفرۆشو میوەفرۆش ئەوەندە زۆرن بەشی هەمووان دەکەن.

لێ شۆستەکان، پەستم دەکەنو ئەوەندە تەنگو باریکن کە ناکرێ شان بە شانی یەکتر رێ بکەی. یان دەبێ پێش بکەوێ، یان دوا بکەوی. یان خێرا بڕۆی یان رێی خەڵکی بکەی. ئەگەر چاو داخەی لەکەو پەڵە دەبینی. شۆستەکە پەکپارچە پەڵەیە. پەڵەی ئاو، بەڵغەم، چەوریو یان سەوزەی پلیشاوە، خوا دایناوە بۆ خوێندکارانی بەشی دەروونناسی کە حەز دەکەن سەر لە خەیاڵاتی بەشەران دەربێنن.

کە سەرت بەرز دەگریو بیر دەکەیەوە، ناکرێ پۆزی ئەم دیمەنە چەند چاو پۆشیشی لێ بکەی، بەسەر هیچ کەسێك دا لێ بدەی. سەربانەکان یەکپارچە دوکەڵو دیمەنی ئەو جلانەن کە ئیژی بە نەشۆراوی هەڵیان خستوون. خانوو و بیناکان بەرزو نزمو تێك ترنجاون. هەر کۆڵانێ دەگریت چەند بینایەکی نیوەچڵو تەواو نەکراوی تێدایە لەگەڵ کۆمەڵێك شێلمانو کیسە چیمەنتۆو عارەبانەی دەستیو گەلابەی پڕ لە خاكو خۆڵ.

لە هەموو لایەکەوە خەریکن خانووە کۆنەکان دەڕوخێننو ئاپارتمانو قەسر دروست دەکەن. پنجە گوڵەباخو یاسی ماڵە نیوە روخاوەکان هێندەیان گەردو تۆز لێ نیشتووە کە بە کاری شاعیرانیش نایەن. لێرەو لەوێ، خانووی تازە، کەمێ دواتر لەخانووە کۆنەکان، بە هەیوانانی بچووكو دەرگای ئاسنی موشەبەکەوە بەرچاو دەکەون. گەڕەکەکە وەکو

جەعفەر ئەشقی لێهاتووە، کە عەینەکی هەتاوی لە چاو دەکاتو قژی بۆ سەرەوە شانە دەکات، بەڵام پێڵاوەکانی هەمیشە شڕو دڕاون.

لە هەفتەی یەکەمدا پارکی سەری شەقامەکەم کەشف کرد. پارکێکە بەشەری لە دار و درەختی زیاترە. پیرانی گەڕەك بە ریز، لەسەر تەختەکان دانیشتوون. یەژی لە جامخانەیەکی بێ جام و شووشەدا دایان ناون تا خەڵکی تەمەشایان بکەن.

کاتێ بۆ پارکەکە، یانی بۆ ئەو گۆڕە سێ گۆشەیەی شەقامەکە دەڕۆین، منداڵەکان بەغاردان خۆ دەگەیەننە لای جۆلانەو خلیسکانێکانی ئەوسەری پارکەکە، کە لە قەرەباڵغیو تەپوتۆزدا لە سوچێکی دۆزەخ دەچێت.

منو ئەمیر دەسوڕێینەوەو لە نێو پیرەکاندا چاو بۆ شێوەی ئایندەی خۆمان دەگێڕین. من هەمیشە جوانترینو رێكوپێکترین پیر هەڵدەبژێرم. دڵم نایەت پیرێکی سەر ڕوتاوەی کوێرەموشەی نیشان بدەم و بڵێم ئەمە ئایندەی تۆیە.

پیرەمێرەکەی من ئەوەندە قەموور نیە کە نەتوانێ ترۆپکی درەختەکان ببینێ. شانەکانی هەر چەندە لاوازن لێ هێشتا پرشنگی ڤیانو حەزو کونجکاوی لە نیگایدا —تەنانەت لە پشت عەینەکە ئەستورەکەشیەوە- دەدرەوشێتەوە. لێ ئەمیر پیرەژنێکم نیشان دەدات، کە لە زەرفێکی کاغەزی کۆنی چرچو لۆچو گرمۆڵە بوو دەچێت،و دەڵێت: "تۆی دوای بیست ساڵ".

کە دەڕۆم بۆ چواررییانەکە، یانی یەکەمین چوارریانی دوای کۆڵانەکەی خۆمان، هەست دەکەم ئێرە زیاتر هندوستانە، سەرزەمینێکە تەژی لەو



بۆنانەی کە فەزای خاڵی بەینی بەشەرەکان پڕ دەکاتەوەو دەگەڵ هەر هەناسەو نەفەسێکدا دەگۆڕێ، بۆنەکان ئاوێتەی یەکدی دەبنو لووتو کەپوو بۆ چەند ساتێك هەستی جیاکردنەوەیان لە دەست دەدات. لە موغازەی ماست فرۆشەکە ڕەت دەبمو شاهین گازدەکەم، لەو کاتەدا هەستدەکەم کە پەڕەی کەپووم لەبەر تیژی بۆنەکە کەوتووەتە لەرزە. لەو دەمەدا جیاکردنەوەی بۆنی شیری کولاو لە بۆنی ئاوی سەروپێ، هەمان بایەخی جیاکردنەوەی دڵ یەشەم لە ژانە سك لەلا پەیدا دەکات.

ئێرە چ چین بێو چ هندوستان پڕە لە بەشەر، زۆربەشیان منداڵن. تەحا کە منداڵ زۆرە. ئەمیر دەڵێت ئالودە زۆرترە. کەمێك دوای فراڤینو نیوە رۆژە کۆڵانەکە پڕ دەبێت لە خەڵکی. تەنانەت گەراج-ەکەش پڕە، رێگای قاڵدرمەکانیش. کاغەزێکیان بە دیواری قاڵدرمەکاندا هەڵواسیوە تکا لە دانیشتوانی بەڕێز کراوە، کە لە کاتی پشوو و ئیسراحەتدا منداڵان نەنێرنە حەوشەکە.

بەڕێوەبەری بیناکە دەڵێت: "هەموو مانگێك کاغەزێکی تازە هەڵدەواسم، دەمو دەست دەیدڕن".

پێدەکەنێ. خۆیشی سێ منداڵی هەیە.

# 2

رووبەری ماڵەکەی ئێمە پەنجا مەترە. بە ئەندازەی باخچەی ماڵێکی مامناوەندی سەرووی شارە. بۆیە ئەمیر دەڵێت: "ئەوەندە مەڵێ ماڵەکەم ماڵەکەم."

ئێرە نۆیەمین خانووە، کە ماڵمان بۆی گواستووتەوە،و هەستێکمان لا دروست بووە، کە لە هیچ یەکێك لە بارکردنەکانی پێشوماندا ئەو هەستەمان لا نەبوو. ئەمیر شەرمی دێت ئەم هەستانەی لەلا بێ چ جای ئەمەی کە بخوازێ شتێکی دەربارە بڵێت.

لێ من حەزدەکەم باسی خانووەکەمان بکەم. لەم خانووەدا کرێچی کەس نین، هیچ خاوەن خانوویەکمان بەسەرەوە نیە. خاوەن خانوو شەیتان نییە بەڵام بە هەمان ئەندازە دەتوانێ روحی مرۆڤ کۆنترۆڵو داگیر بکات.

ئەمێستا ئازادین، ناو ماڵو شتەکانمان بێ ئەوەی ترسی ئەوەمان هەبێ بەر دەرکەو دیوار بکەون، دەگوازینەوە. منداڵەکان ئازادن بە دەنگی بەرز قسە بکەن. گەمە بکەن. هاوار بکەنو تەنانەت غار بدەن و ڕاکەڕاك بکەن. من دەتوانم عادەتی وس، وس بن، وەکو عادەتێکی فەقیرانە بۆ هەمیشە وەلاوەبنەم.



هەست بە ئازادی دەکەم و باسی ئازادی دەکەم، لێ ئەمیر ڕێگە نادات ئەو زاراوەیە بەم هەموو گرینگیەی خۆیەوە دەربارەی ئەو هەستە بچووك و ناچیزە بەکار بەرم. ئازادی لە مەودای جیهانیدا مانای هەیە، لە مەودای مێژووییدا مانای هەیە، لێ لە ناو خانوویەکی قەناسی پەنجا مەتریدا لە گەڕەکێکی قەرەباڵغ و لە وڵاتێکی جیهانی سێیەمدا... ئاخ چۆن دەتوانم ئەمەندە نەزان بم؟

تا ئەو کاتەی ئەمیر لە ماڵە بۆم نیە نەزان بم. لەبەر ئەمە چاوەڕوان دەکەم تا ئەو بڕواتە دەرێ.

حەوشە چکۆڵەکەی پشتەوە یەکپارچە بۆنی شەمبلیلکە، هاوسێکەی سەرەوەمان مەکینەیەکی سەوزە جنینی هەیە کە کیلۆ کیلۆ سەوزەی پێ دەجنێو ورد دەکات. چەند هەفتەیەکی پێ چوو تا دەگەڵ ئەم بۆنەدا ڕاهاتم. پەردەکانی ماڵەکەمان لە من زووتر راهاتن، لە جیاتی بۆنی قوماشو پارچە بۆنی شەمبلیلك-یان لێدێت.

لەسەر کورسی موبەقەکە دادەنیشم و تەمەشای ناو حەوشە چکۆڵەکەی پشتەوە، کە هیچ کاتێك چۆڵ نیە -پڕە لە بۆنو هەراو زەناو پێشکە- دەکەم. دیوارەکانی چیمەنتۆیەو سێ پەنجەرەی هاوشێوەی لەسەر دەرگا شووشەییەکەی موبەقەکەوە هەیە. مخابن کە ئاسمان دوورە. دەبێ ملت تەواو بە پشتا بنوشتێنیەوە ئەوجا بتوانێ بە ئاستەم توزقاڵێکی ئاسمان بدینی. بۆ رازاندنەوەو جوانکردنی حەوشە چکلۆڵەکەی پشتەوە کارێکی زۆرم کردووە. سێبەرو ساباتێکی چکۆڵەم بە پلاستیك-ی روون بۆ دروستکردووە، بانیژەیەکی روناکم لەسەر دەگا شووشەییەکەی دروست

کردووە. چەند ئینجانەو گوڵدانێکم داناوەو منداڵەکان یەك دنیا ورتکەو پرتکەیان بە دیوارەکانیا هەڵواسیوە.

دەبێ هەستمو چرا داگیرسێنم، روناکی ناو خانووەکە خراپ دابەش کراوە، موبەقەکە لە ئێستاوە دەڵێی شەوە. هۆڵەکە عەسرەو ژووری نووستن رۆژە. شادیو شاهین گازدەکەم. کێوە چوون؟ دوای هەفتەیە دووان لە کوتەك خواردنو غەریبی، هەنوکە لە ماڵەوە بەند نابن. لەگەڵ رۆییشتنی ئەواندا، لە تۆ وایە دەنگ و هەراکەش رۆییوە. زۆر کەم رێکدەکەوێ کە ئەم کاتانەی عەسر ماڵەکە وا کرو کپ بێ، ئەم تەنیاییە ئەو تەنیاییە نیە کە هەموو رۆژێك خۆزیام بۆ دەخواست. زیاتر لە بیکەسی دەچێت. یەژی هەموان تۆیان لێرە بەجێهێشتووەو رۆییوون.

لاق لەسەر لاق دادەنێمو زەق زەق دەڕوانمە دیوارە نزیكو چیمەنتۆکەی حەوشەکەی پشتەوە. ناتوانم بیر لە درێژی دیوارەکەو پەنجەرەکان نەکەمەوە کە تەنیا بۆنی هالاوی خواردنیان لێ دێتە دەرێ. ئەم هەموو تەمەشاکردنی دیوارە چ سوودێکی هەیە؟ چاکتر وایە رووی کورسییەکەم وەرگێڕم. هەندێجار وەرچەرخانێکی چکۆڵەی کورسیەك حاڵی بەشەر باشتر دەکات.

رێك لەم کاتەدا دەنگ دێت. جیاوازی ئەم خانووە لە خانووەکانی پێشوو لەمەدایە کە دیوارەکانی سەرما یان ڕتوبەت نادەنەوە. دەنگ دەدەنەوە. هیچ دیوارێك لە دیوارەکانی ئەم خانووە دیوار نیە. تیغەیەکی گەچینە کە دەنگانی دی لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە تا لە کاتی خۆیدا ئاو دیویان بکات، لێرەدا پێویست ناکا گوێت بە دیوارەکەوە بنەیت. لەمەودای دووریشەوە دەنگەکان، چ بەرزو چ نزم بە گوێ دەگەن.



لێ ئەم دەنگە، میناکی هیچ یەکێك لە دەنگەکانی ئەم ژیانە نیە، ئێژی لە دنیایەکی ترەوە دێ، لە هەمان پەڵە ئاسمانی زۆر دوورەوە دێت. میناکی دەنگی دڵە. رێکوردەر نیە. دەنگێکی زندووە. دەنگی دەفە. کەسێك خەریکی دەف لێدانە. ئەم بینایەو دەف؟ دەنگەکە بەرزتر دەبیت. بەرزتر لە هەموو دەنگەکانی دی.

وەکو پزێك زۆر بەپەلە گەشە بکاتو بخەملێ، بە پەلە گەشە دەکەم، گەورە دەبم، لە کورسیەکە دەبمەوە. حەوشە چکۆلەکە گیانی وەبەرکەوتووە. دیوارەکان چوونەتە دواوە. دەنگی دەفەکە لە پەنجەرەی قاتی چوارەمەوە دێ.

دەستو باڵم رادەتەکێنمو کێشمانێکی خۆم دەدەم، رووم وەردەگێڕمو تەمەشای پەنجەرەی نهۆمی چوارەم، کە ئێستا میناکی پەنجەرەکانی دی نیە، دەکەم.

چاوانم دەنوقێنمو گوێ بۆ دەنگی دڵی خۆم رادەدێرم، کە چاوان دەکەمەوە شادیو شاهین دەبینم لە ناوەندی موبەقەکەدا وێستاونو بە واقی وڕو دەمی داچەقاوەوە تەماشام دەکەن.

# 3

ئەمیر دەڵێت: "خانووەکە دەفروشم."

حەز لە قسەی بێ پێشەکی ناکەم، هەمیشە پێویستم بە خۆ ئامادەکردنە. ناتوانم هیچ کارێکی راستەوخۆو بەپەلە بکەم. بۆیە هەمیشە کەمێك لە پاشم. بۆ ئاهەنگی خەنەبەندانو زەماوەندو خەتمو پرسەش درەنگ دەکەوم. دایکم دەڵێت خەنەی پاش خەنەبەندان بەکاری چی دێ؟ ئەمیر دەڵێت ئەوەی زەوقو تاقەتی دیتنی نیشانانی نەبێت ناچارە خۆی ڕادەستی ڕێکەوت بکات، دەبێ ڕێکەوتەکانی پێ هەرس بکرێت. من ئێستا دووچاری بەد هەرەسی بووم. قسەکانی ئەمیر دەرك ناکەم.

لەوەتای گواستوومانەتەوە بۆ ئەم خانووە ئەمە یەکەمجارە کە ئەم قسەیە دەکات. فرۆشتن یانی ڕۆییشتن لەم خانووە، لێ تازە ئەم خانووەمان کڕیوە. هێشتا نەبووە بە ساڵێك.

هەموو لە گەراجەکەدا خڕ بوونەتەوە. ئەو پیاوەی کە پاشان دەبێت بە بەڕێوەبەری تەلارەکە داوا لە هەموو دەکات بۆ ئاشنا بوون دەگەڵ یەکتردا، پێی بڵێین لە خانووی خۆدان یان کرێچین؟ نۆرە دێتە سەر من، دەڵێم موڵکی خۆمانە. سەرم لە تامی شیرینی ئەو قسەیە سوڕ دەمێنێ.



دێمە سەرێ وەکو چۆن نوقڵێك-ی بادەمی بە جارێ زار پڕ دەکات لە تام، بەو ئاوایە وشەکە لە دەمم دا دەمژم، موڵك، خودایا من خودان موڵکم. موڵکدار.

ئەم وشەیە گەورەی کردووم. یانی بابایەکی موفلیسو نابووت نیم. ئیدی دەربەدەر نیم. ئەم دیوارانە هی ئێمەن. ئەم قاڵدڕمانە هی ئێمەن، ئەم حەمامو تەوالێتو دەستشۆرە هی ئێمەیە. تا ماوەیەکی زۆر ئەفسوونی ئەم تاقە وشەیە دەبم. باوەڕم نایەت تاقە وشەیەك بتوانێ ئەم جۆرە کارە لە بەشەر بکات. هەرگیز نەمدەزانی موڵکداران دەتوانن ئەوەندە خۆشحاڵ بن.

"گوێت لێمە چ دەڵێم. خانووەکە دەفرۆشم. پێویستم بە پارەکەیەتی. لەم ڕۆژانەدا لە نووسینگەوە بۆ تەمەشاکردنی دێن."

بە هۆی هەورازچوونی تەمەنمەوەیە کە دەمو دەست هەڵناچم. لە ماوەی چەند دەمێك دا، لە نێو چەند ڕەفتارو هەڵوێستێکی مومکیندا، یەکێکیان هەڵدەبژێرم. پێویست بە هەڵسانو هاتو هاوارکردن ناکات. بە دانیشتنانیشەوە دەشێت پارێزگاری لە خانووەکە بکرێ.

"خانووەکە نافرۆشم."

کەیفم بە دەنگی خۆم دێت. نەدەلەرزێت. نە نیگەرانە. ئاسوودەو ئەرخایەنە.

# 4

من دەڕۆم، ئەو دەڕوات. ئێمە دەڕۆین. ڕۆییشتن تاقە کارێکە کە ئەمیر هەمیشە پێوەی خەریکە.

نەفرەت لەم شانسە! هێشتا تامی لە یەك شوێنا مانەوەمان نەچەشتووە کە ئەو دیسان دەیەوێ بڕوات، شەهلا دەڵێت:

"ئەمیر دیسان فیلی کەوتووەتە بیری هندوستان."

دەڵێم ئەمەیان فیل نیە کەرگەدەنە. کەرگەدەن هەمیشە بە تەنێ دەڕوات، کاشکێ منیش فیلێکم هەباو بیری هندوستان یان شوێنێکی نزیکتری بکردایە.

ئەمیر بەرەو ئایندە دەڕوات. ئاشقی ئایندەیە. حەز لە ڕابردوو ناکات، چ ڕابردوویەکیش، رابردوویەکی ژنانە کە نە چوونە سەر دیوارو نە بازدانی تیایە، نە پاسکیل سواریو نە تۆپ تۆپێنی ناو گەڕەك. ڕابردوویەکی پڕ لە چپەچپو فسکەفسكو ماڵەباجێنە. ڕابردوویەك کە دەچێتەوە سەر ژێر زەمینانی تاریكو وچخانان. ئەمیر ئامادە نیە تاقە یەك هەنگاو دەگەڵ مندا بۆ دواوە بگەڕێتەوە.

منیش رابردووم خۆش ناوێ. بە داخەوەم، کە رابردوو منی خۆش دەوێ. هەندێجار وەکو جانەوەرێك سواری کۆڵم دەبێتو نیازو خەیاڵی دابەزینی



نیە. وام بیر دەکردەوە پاش شووکردنم بە ئەمیر، بتوانم ئەو جانەوەرە بدەم بە عاردیدا، لە کۆڵ خۆمی بکەمەوە. ئاواتەخواز بووم بە ئاسانی لە شەڕی لە دەستدانی پەردەی کچێنی رزگار ببم.

بۆیە شەوێك لەو شەوانەی کە وەهمو خەیاڵ زاڵەو راستگۆیی باکیرەو پاکیزەیە، باسی جانەوەرەکەی کۆڵی خۆم بۆ ئەمیر کرد. لە قەمورێك دەچووم کە بخوازێت نهێنی قەموریەکەی ئاشکرا بکات.

ئەمیر مینگە مینگەکەی پێ بڕیم. ئایا بەر لەو کەسێکی دیکەم خۆش ویستووە؟ وەڵامەکەی خۆی وەرگرتو بە ئاسوودەیی پیاوێکی بەختەوەر لێی ڕاکشا. لێ من هێشتا قسەکەم تەواو نەکردبوو. خەریکی قسەکردن بووم کە ئەمیر بە چاوانی خەواڵووەوە دەستی خستە سەر زارم.

"گرینگ نیە کە پەیوەندی دیت دەگەڵ کەسانی تردا هەبووەو چیان کردووە. گرینگ خۆتیو لە ئێستا بە دواوەت هی منی."

رەفتارەکەی جوانو دڵگیر بوو، لێ جۆرە نیگەرانیو پەشێوەیەکیش لەو دیو قسە رۆمانسییەکانیەوە هەبوو. دەمزانی کە ئەو دەگەڵ مندا بۆ هیچ جێیەك نایەت. ڕاچڵەکیمو هەستی تەنیاییو نائومێدی وەکو هەوێیەك کەوتە بەینی منو ئەمیرەوە. رۆژگارێکی زۆری دەویست تا چاوپۆشی لە یەکتر بکەینو هەر کەسەو بە تەنێ بەڕێی خۆدا بڕۆین.

## 5

"کابرا خەریك بوو خۆی بەر چەقۆ دەدا، کە ئێمە گەییشتین بە سەریا. تا خەڵکەکە فریاکەوتن دەستی بگرن خۆی کۆڵەوار کردبوو. منو حوسەینی لەوانی دی زووتر گەییشتین بەسەریا. خەریك بوو ژنەکەیان بە ئەمبولانس دەبرد. دەیانگوت تەواو بووە".

ئەمیر دیسان خەبەری هێناوە. باوکە گیان هەمیشە بە دەستی پڕەوە بۆ ماڵ دەهاتەوە، بە باوەشێ میوەوە. ئێمەی منداڵ نزیکی عەسر لە پشت دەرگاکەوە ئێشکمان دەگرتو هەرکە ئەومان دەبینی غارمان دەدا تا کیسەو زەرفەکانی لە دەست وەربگرین.

دایکم دەڵێت: "باوکتان هەرچیەك بوو عادەتێکی باشی هەبوو، هیچ کاتێ بە دەستی بە تاڵ بۆ ماڵ نە دەگەڕایەوە".

ئەمیرش بە دەستی بە تاڵ نایەتەوە، کیسەی پڕ لە هەواڵ، رووداو، واریقات دەگەڵ خۆیدا دێنێ. بە درێژایی ئەم ساڵانە فێر بووە کە کامیان لە پێشدا بڵێو کامیان لە دوایی دا بڵێ. فێری ئەوە بووە نیوەی رووداوەکە بگێڕێتەوەو بۆ گێڕانەوەی نیوەکەی تری ناز بکات. دەزانێ کامیان بە ئاوو تاو بگێڕێتەوەو کامیان بە پەلە لە کۆڵ بکاتەوە. دەزانێ کە مشتەریو کڕیاری هەر هەموو ورتکەو پرتکەی ناو کیسەکەیم.



بەتاڵکردنی کیسەکەی رێورەسمی خۆی هەیە. دەبێ کتریەکە لەسەر ئاگر بێ. چای دەمکێشاو وئامادە دەگەڵ قاپە ناوکەو ئاجیلو پستەدا کە بۆ پێستی من باش نیە، لێ بۆ گەرم بوونی چەنەی ئەو زۆر عالە.

ئەمیر دەڵێت: "شارەزاد رەگەزی خۆی گۆڕیوە. بووە بە پیاو" کە ئەمیر خۆی بە شارەزاد دادەنێ بەم پێودانگە منیش بەر لەوەی فریا بکەوم تاجی شاهی لەسەر بنەم سەدای هاواری جوجگ خۆر لە ناو تەلارەکەدا دەنگ دەداتەوە. ئەمە نازناوێکە کە خانم هاشمی لە ژنەکەی قاتی یەکەمی ناوە.

"مێردەکەی دە ساڵێك لە خۆی بچووکترە".

جوجە، زاهیری خەریکی کاری کڕینو فرۆتنی ترومبێلە. هەفتەی سێ رۆژ لە ماڵەوە نیە. پاشان بە ترومبیلێکی مۆدێل بەرزەوە سەروسەکوتی پەیدا دەبێ. لەبەر دەرگاکەدا ڕایدەگرێتو هەر لەبەر دەرگاوە هاتو هاواری بەرز دەبێتەوە.

لە هاوێنەی کونی دەرگاکەوە تەمەشا دەکەم، لە زەتێکی زۆر لەم کارە دەبینم، هەمان ئەو لەزەتەی کە خەڵکانێك بە خۆیان هەموو شتێك دەبینن، بەڵام کەس ئەوان نابینێ. دەرگای هاوسێکەی بەرانبەرمان کونو هاوێنەی نیە. بۆیە درزی کردووەتە دەرگاکە.

ئاغای هاشمی لەسەر پلیکانەکان وێستاوەو بە جۆرێ سەری دەلەقێنێ لە تۆ وایە ئاشتی خوازترین بەشەری ئەم دنیایەیە.

دەنگێك بەرز دەبێتەوە، بۆمان بە دیار دەکەوێ، کە جوجە بە لەپی دەست دەرگا دەکوتێ. هاوار دەکات:

"بە پیر، بە پێغەمبەر من هەڵم نەگرت". نەم بردووە.

بەر لەوەی خەڵکی تەلارەکە مەزەندەی ئەوە لێبدەن کە چ شتێکی نەبردووە، ئایدا هاواری لێ بەرز دەبێتەوە.

منداڵەکان نووستوون. لە تەنیشت ئەمیرەوە دادەنیشم. چاپەکەی سارد بووەتەوەو ئاجیلو ناوکەش ناخوات.

"نازانم حوسەینی لە پڕ چی بەسەرا هات. هەر لەوێوە بۆ ماڵی خۆی ڕۆییشتەوە. گوتی خۆت شتێك بە ئەندازیارەکە بڵێ."

بێدەنگ دەبێت.

"چایەکەت بۆ بگۆڕم؟"

دەڵێت: "بۆچی ڕۆیی؟"

بە کاوەخۆ تەکانی دەدەم "واز لە مانە بێنە. باسی شتێکی خۆش بکە، شتێکی عەشقی."

"ئەشقی چی. ئەشق کوا. هەر هەمووی پۆخڵەواتکاریە. کەنەداکەمان بیێ لە هەموو ئەمانە رزگار دەبین".



# 6

ئەمیر شەیدای کەنەدایە. هەمووان بەمە دەزانن. هەر کەسێك هەواڵێکی تازەی لەمەڕ ژیان لە کەنەدادا دەست بکەوێ، یەکسەر بەوی دەگەیەنێ، هەندێ جار بە جۆرێ باسی کەنەدا دەکات لە تۆ وایە ساڵەهای ساڵ لەوێندەر ژیاوە. ئاه هەڵدەکێشێتو دەڵێت:

"دەڕۆم بۆ کەنەداو تەواو."

کاتێ دەگاتە بنبەست، ئەمە دەڵێت. کەنەدا لەلایەكو هەر هەموو بەدبەختیو نەگبەتیو گوشارەکانی دی لەلایەك.

ئەمیر ساڵانێك لەوەپێش توانی بووی لە باکۆوە بۆ تورکیاو لەوێندەرەوە تا سنووری یونان بڕوات. تاکو ئەمڕۆ بەلای کەمەوە هەزارجار باسی ئەو بێ موبالاتیە گەوجانەیەی کردووە، لە وێستگەدا دادەبەزێ تا پەرداخێ چای بخواتەوە، تەنیا پەرداخێك چایو هیچی تر. بەڵام فرێکی لێدەداو نادا ساتێك لە ساتە هەرە هەستیارو گرینگەکانی ژیانی چێدەبێت، هەوای گەرم، بۆفیەی پڕ لە نۆشابەی ڕەنگاو ڕەنگ، ئەو تەختە سەوزەی کە لەسەری دانیشتووە. سەنگی دەستێکی قورسو گران بەسەر شانیەوەو دەنگی ناسازی پولیسێکی تورك "پاسپۆرتەکەت".

دەبوایە ئەم ساڵانە تێپەڕیبا تا دڕوی دڕکەجاڕی سنووری تورکیاو یونان بە لەشیا بچنو چیتر زامەکانی نەیەشێن "ئاخ، قوربانی ئەو دڕوانە بم. یەك جاری دیکە لەوێندەرەوە ڕەت بم ئیدی تەواوە، هەر ئاوڕیش نادەمەوە".

شاهین وەکو ئەمیر ئاخ هەڵدەکێشێت، بە هەمان حاڵەتی نمایشییەوە روو لە میچەکە دەکات.

"منیش بڕۆم ئاوڕی پاشەوە نادەمەوە".

هەردووکمان نیگای دەکەین.

"چونکە لێرە هیچم نیە. نە پاسکیلم هەیە، نە ئیسکیت، نە کۆمپیوتەر. و نە هیچ شتێك".

ئەمیر دەڵێت: "پاسکیل بە کەڵکت نایەت پێویستە دەرسەکانت بخوێنی، بۆ ئەوەی بتوانی لەم دەورو زەمانەدا بژی دەبێ خوێنەواریت هەبێ، دەبێ پسپۆڕ بیت".

شاهین دەخوازێ پاسکیلی هەبێت.

"نامەوێ وێڵو سەرگەردان بە کۆڵاناندا بسوڕێیتەوە. دەمەوێ گەشە بکەی، پێبگەی".

شاهین دەڵێت: "من گەشەکردنم ناوێ. پاسکیلم دەوێ".

"دەبێ کار بکەیت تا بە پارەی خۆت پاسکیل بکڕیت."

شاهین نەیگەرەکە کار بکات. دەیەوێ پاسکیل سواری بکات.

ئەم شتانە ئەمیر توڕە دەکات. دەستی بەرز دەکاتەوە، وەك ئەوەی بیەوێ زللەیەکی توند بوەشێنێ. لێ هەرسێکمان دەزانین، کە ئەو دەستە



بەم مەبەستە نایەتە خوارێ. هەفتەی پێشوو هاتە خوارێو شاهین بێئەوەی هەڵێت گوتی:

"ئەگەر بۆ کەنەدا بڕۆین، ئیدی ناتوانی لێم بدەیت. خەبەری پۆلیس دەدەم."

شاهین هەڵنایەت، بە هێمنی ڕادەبێتو دەڕوات بۆ حەوشە چکۆلەکەی پشتەوە. ئەمیر لە جیاتی لێنەدانەکەی دەکەوێتە جوێندانو بە دووی شاهین دا دەڕوات. لە پڕ باران دا دەکات. منو شادی بە دوای ئەمیردا دەڕۆین. بارانی درشت بەسەر ئیرانیتەکەدا دەکەوێتە خرمەخرم.

دەنگی تەك زەربی دەفەکە بەرز دەبێتەوە. بە شاهینو شادی دەڵێم بڕۆن بە دەرسو مەشقەکانیاندا ڕابگەن. هەردووکیان دەڕۆن. ئەمیر لە ژێر ئیرانیتەکە لادەکەوێو لە ژێر بارانەکەدا دەوەستێ. هەمهەمەی بارانەکەو دەفەکە حەوشەکەی پشتەوەی پڕ کردووە. دەچمە موبەقەکەوە بانگی دەکەم: "وەرە ژوورەوە".

من نابینێ، گوێی لە دەنگیشم نابێت. لەوێندەر بە چینچکانەوە دادەنیشێتو هەردوو دەستی دەخاتە پشت ملی، دیوارە چیمەنتۆکەی پشتی پڕە لە پەڵەی باراناو.

"رابە وەرە ژوورێ".

ئەمیر لە کوێیە؟ ڕەنگە لە نێو دڕکە جاڕەکان یان لە شوێنێکی ئەوسەری دنیا بێت. نازانم. لێ ئەم ماڵەدا، ڕۆییوە.

## 7

شادی گازدەکەم. وەڵام ناداتەوە، لەنێو ئەو هاتو هاوارەوە کە لە گەراجەکەوە دێت، دەنگی ئەو ناناسرێتەوە. لە پەنجەرەکەوە تەمەشا دەکەم . شادی دیار نیە. شاهینی بە دوودا دەنێرم. شاهین باسکی ئەوی گرتووەو راکێش راکێش دەیهێنێ، شادی دەقیژێنێ.

"گوتم بانگی بکە، نەمگوت دارکاری بکە."

شادی لە بەردەم خۆما دادەنیشێنمو چەند قسەیەکی بۆ دەکەم. یانی هەمان ئەو کارەی کە دەبوایە دایکم دەگەڵ مندا بیکردبایەو هەرگیز نەیکرد. ئەگەر قسەیەکم پێی بوایە حەوت هەشت جار بە ژوورەکەدا دەهاتمو دەچووم. رۆحم دەهاتە سەرێو قسەکە وەك ئەوەی لە بنەبانی بیرێکدا گیر بووبێ هەر نە دەهاتە سەرێ.

دەبێ شادی فێر بکەم کە ئاگادار بێت. لەگینە کەسێك میهرەبانی دەگەڵدا بکات. لە دنیادا سەد جۆرە میهرەبانی هەیە کە پێویستە جیاوازی نێوانیان بزانێ. دەخوازم پێی بڵێم ئاگای لەو کوڕە گەورانە بێت کە بەردەوام هاتوچۆی تەلارەکە دەکەن. نازانم چۆن بە شێنەیی تێی بگەیەنم  کە لەوەیە کەسێك بێتو بیەوێ لە خشتەی بەرێتو بیەوێ



دەستی بۆ بەرێت، ئەو دەبێ هاوار بکات، شاهین دەپرسێت: "بۆچی دایکە؟"

"لەبەر ئەوەی زەروریە".

مندالەکان سەیرم دەکەن، بووکەڵەکەی شادی لە دەست وەردەگرمو دەیگوشم. بووکەڵەکە دەگری. دەڵێم "وەکو ئەمە".

پیلەکەی لێ دەردێنمو دووبارە بوکەڵەکە دەگوشم.

دەڵێم: "دەبینی، ئەگەر دەنگت دەرنەیەت، لە بووکەڵەی بێ پیلیش خراتری، بێ دڵو دەروون، هەنگێ دەشێت هەر کارێکت لێبکرێ. چونکە کەس پێ نازانێ."

مستێکی توند بە بووکەڵەکەدا دەکێشم. قژەکەی رادەکێشم. لە شادی دەپرسم ئایا تێدەگات، هەست دەکات؟

تۆنی دەنگم زۆر توند بووە، شاهین بە رێزەوە سەیرم دەکات، لێ شادی دەگری. دەستێك بە سەری بووکەڵەکەداو دەستێك بەسەری ئەودا دێنمو قسەو ئامۆژگاریەکانم تەواو دەکەم.

شادی دێتە قسان "ئایدا نانەقەیسی دەکڕێت، بەستەنی دەکڕێت، مژمژە دەکڕێت. بەڵام من پارەم نیە".

حاڵەتی ئەو وتاربێژە داماوەم هەیە کە یەك دانە سەعات دەربارەی هونەر قسەی کردووەو  گوێگرەکانی پرسیاری ئابووری لێدەکەن.

"ئایدا عەینەکی هەیە. پاسکیلی هەیە بەڵام من هیچم نیە".

دەڵێم کە ئەویش زۆر شتی هەیە. شاهین دەڵێت:

"تەنیا شعورو هەستی نیە دایکە".

شادی دەڵێت: "خۆت نیتە".

شاهین بیانووی کەوتووەتە دەست. ئامادەی پەلامار دەبێ.

"دەی بڵێ من چیم نیە؟"

شادی مستی دەکاتەوەو پێدەکەنێ.

"نۆکی برژاو".



# 8

دایکم بەبێ خواحافیزی لە ماڵی ئێمە رۆیی. یان ئەوەندە نەخۆش بوو کە بیری چوو خودا حافیزی بکات یان لە بیری بوو و بە ئانقەست خوداحافیزی نەکرد. رێك لە بەردەم دەرگاکەدا، ئاوێنەیەکی لاکێشەییم بە دیوارەکەوە هەڵواسیوە، لە ئاوێنەکەدا نیگای پڕ حەقارەتی ئەمیرم بینی. ئەمیر دایکەی خۆش ناوێ‌و لەم جۆرە کاتانەدا رقیشی لێیەتی. دایکم هەست بەمە دەکات. دەزانم کە بەم هەستەوە لە ماڵی ئێمە دەڕوات.

ئەمشەو دایکە لە ماوەی یەك سەعاتدا پتر لە دەجار چووە سەر ئاوو نالاندنی‌و گریا.

"نەدە بوو کەشك بکەیتە شلەکەوە، گوشارم بەرز بووەتەوە".

بەدەم لەرزینەوە پەتۆکەی دا بەشانیا.

"ئەگەر لە ماڵەوە بوایەم نەعنام دەکوڵاند، لەوەیە سەرمام بووبێ."

بەبێ قسە لە ژوورەوە دەچووم بۆ موبەقەکەو دەگەڕامەوە. لێ لە راستیا بیرم لە نەعناو لە بەرزی گوشارەکەی ئەو دەکردەوە، هیچم نەدەگوت. لەو دەمەدا بیرم لە بێدەنگی خۆم کردەوە. بێدەنگیەکەم حاڵەتی جلێکی خوازراوی هەبوو کە لە پڕ هەستم پێکردبوو.

هەستم کرد بێدەنگیەکەم ڕیشەو رابردووی خۆی هەیە. زۆر جار لەسەر ئەو بێدەنگیە ستایش کراوم. حەوت هەشت ساڵان بووم کە زانیم هەموو منداڵێك ئەو سوخەتەی نیە. بێدەنگ من بە یەکەمین دارایی‌و سەروەتم دەژمێردرا. رۆژێك باوکە گیان بردمیە ژێر زەمینەکەو پرسی:

"دوێنێ دەگەڵ پورە مەحبوب دا بۆ کوی چوو بوون؟"

لاڵ بووم نەك لە ئاقڵی دا بەڵکو لە ترسا. هەستم پێی گوتم پرسیارێك کە لە ژێر زەمین داو بێ هەڵکردنی گڵۆپ لە بەشەر بکرێت، وەڵامەکەی کارەساتی لێدەکەوێتەوە. باوکە گیان بە گومانەوە نیگای کردم. هەرگیز لە کچۆڵانی هارو هاج‌و لاسارو ئاتەشپارەو ئاگری ژێر کایان نەدەچوومو باوکەش، چونکە لە هیچ کارێکدا رژدو عینادو سەرسەخت نەبوو زۆر زوو نائومێد بوو و لە ژێر زەمینەکە وەدەرکەوت. ئەو پاداشتەی کە دوای یەك سەعات لە زمانی نەرمی دایکم وەرگرت، کلیلدانی سادەو ترسنۆکانەی زارم واتە بێدەنگییەکەمی کرد بە کارێکی پڕ ماناو ئاقلانە.

بە درێژایی ساڵەکانی دوای ئەوە، چەندین جار لەلایەن ژنانی ماڵباتەکەمانەوە، لەسەر مەندی‌و مەنگی‌و بێدەنگییەکەم ستایش‌و ئافەرین کرام. لەسەر سڕ قایمییەکەم. زۆر زوو بۆم دەرکەوت کە لە سەندوقۆکەیەکی پڕ رازو نهێنی، توند قەپات کراو دەچم.

پورە مەحبوب ئەوەی گوت‌و پاشان کەوتە سەر زاری خەڵکانی دیکەش، ئەگەر رازێك بڵابوایەتەوە، ئەگەر شتێك ئاشکرا بوایە هەموان تەمەشای (مهین)یان دەکرد. من لە هەر نیگایەکی گومانامێز دوور کەوتبوومەوە.



لە دوای مردنی باوکە گیان بوو کە بێدەنگییەکەم شکاند، ئەویش بە هاوار. لە نەخش‌و رۆڵە هەمیشەییەکەم یاخی بوو بووم. حەزم دەکرد دنیاوبنیا هەموو شتێك بزانن. نەمدەویست شەریکە تاوانی هیچ کەسێك بم، تەنانەت داکیشم. بۆیە هاوارم کرد. باوکە گیان، وەکو منداڵێکی تەنیا مردبوو. ئەمەم زۆر لەبەر گران‌و ناخۆش بوو، عەزابی دەدام. دایکە وەڵامی هاوارەکەی بەهاوار دامەوە. شەهلاو مهین لایەنی دایکەیان گرت. گوتیان گەوج بووم‌و باشترە بێدەنگ ببم. لێ من هەر هاوارو گریەم بوو. باوکە گیان وەکو منداڵێك مردبوو. سەری کەمێك لە دۆشەکەکە شۆڕ بوو بووەوەو مردبوو. مهین ناچار بوو ماچم بکات‌و بە تکاو پاڕانەوە لە ژێر زەمینەکە دوورم بخاتەوە. هیچ کاتێك وەکو ئەو رۆژەی کە باوکە گیان مرد، لەو نزیك نەبوو بوومەوە.

شەهلا دەیگوت: "ئەگەر ئەوە وەبیر خۆ بێنیەوە کە باوکە گیان چەند زاڵم‌و سەختگیر بوو، هێور دەبیتەوە". لێ من هاوارم دەکرد ئەگەر زاڵم‌و سەختگیر بوو ئەدی بۆچی نەیتوانی وەکو زاڵمای بمرێت. دایکەش هاواری دەکرد. ئەو بەیانیە پڕ لە هاوارو گریانە بە تەواوەتی نائومێدی کردم. زانیم کە هیچ راستیەك لە نێوان من‌و دایکمدا نیە.

کە لە ماڵی باوکە گیانەوە هاتمە ماڵی ئەمیر نەخش‌و رۆڵی سەندوقۆکە ئاساکەم بەتاڵ بووەوە. ئەمیر لە بێدەنگی‌و مەنگییەکەم پەست‌و تورە دەبوو. دەیویست قسە بکەم، باسی رووداوەکانی رۆژ، خەبەرو هەواڵەکانی گەڕەك‌و بان، باسی شەهلا، مهین بکەم. لە ژیانی تازەمدا باوی رازو نهێنی نەما، دووری‌و جودایی لێدەکەوتەوە. گومانی دروست دەکرد. ئەگەر شتێك دێرتر لە وەختی ئاسایی کەشف بوایە شەڕی

لێدەکەوتەوە. ئەمیر حەزی لە ڕاشکاویو شەفافیەت بوو. لە بێدەنگی من دەترسا. بەرە بەرە زمانم کرایەوە، لەسەر زۆر بێـژی ڕاهـاتم. تەنانـەت لـە هەندێ کاتا کە پێویستیش نەبوو. دوای ساڵانێکی زۆر فێر بـوومو زانـیم کە قسە دەشێت نهێنگەیەکی باشتر لە بێدەنگی بێ.

لێ سەرباری سـاڵانێك لـە مەشـقو ڕاهێنـان، گفتوگـۆی دەروونـی، مەنەلۆگ، هیچ کاتێك بە شێوەیەکی تەواو سەری نەکردو نەهاتـە دەرێ، هێشتاش هەر بە کەسێکی کەم دوو دەژمێردرێم. دایکم دەڵێت:

"چـوویتەتەوە سـەر ئـەوە ڕەحمەتیـە. دوو کەلیمـە قـسەی دەگـەڵ بنیادەمدا نەدەکرد."

هەردووکمان هاوزەمان وەبیرمـان دەکەوێتـەوە کـە لـە ڕۆژەکـانی دوا دواییدا قسەی دەکرد. زۆریش. دایکـە دەیڵێیتـەوەو دووبـارەی دەکاتـەوە: "دوو قسەی ماقول".

ئەمشەو نەعنام بۆ دایکە نەکوڵاند یان وەختێ کـە گـوتی: "خودایـا گوشارم بەرز بووەتەوە"، پێم نەگوت حەبێك بخۆ، ئەو شـتەی کـە شـەهلا دەیگوت. مژولو سەرقاڵ بووم. دەرگای یەخچاڵەکە خاوێن بوو، لـێ مـن دووبارە پەڕۆیەکم پێدا هێناو کەوتمـە خاوێنکردنـەوەی کۆنـە پەڵـەکانی سۆپا غازەکە. دەمزانی کە دەبێ شتێك، هەر چەند گەوجانەش بێ، بڵێم.

بێدەنگیەکەم وەکو جلێکی خوری تەنگ لە جەوی گـەرم دا ئەزیـەتی دەدام. دەمویست دای بکەنم. دایکـە دەی ناڵانـدو بـە دەم ناڵـەو گریـەوە پیلاوەکانی لە پێ دەکردو من هێشتا نەم توانی بوو ئەو نەخشو ئەرکەی خۆم بۆ خۆم دانا بوو، جێبەجێ بکەم. لە هەمان شـوێنو لـە نێـو چـوار چێوەی دەرگاکەدا وەستام. بەو ئومێدەی هەموو شتێك حاڵـەتی ئاسـایی



خۆی وەربگرێت، خوا حافیزی ئاسایی دایكو کیـژێك لـە یـەکتری. وەکـو چۆن هەتوانێك دەردو ئـازار کـەم دەکاتـەوە بـەو ئاوایـە پێویـستم بـەو عادەتو دابە کۆنەی دنیا هەبوو. لێ دایکە بە قاڵدرمەکاندا داگەڕا، لە چاو ون بوو، هەر ئاوڕیشی نەدایەوە.

# 9

دایكه له كاتی ئازاردا ناگری. كه تەلەفۆنەكە زۆر زەنگ لێدەدا، یان دەنگی تەلەفزیۆنەكە زۆر بەرزە، دەگری. كاتێ كه سەرمای دەبێتو چەند پەتۆیەك بە خۆیدا دەداتو هەر گەرمی نابێتەوە یا كاتێ شەهلا لە دایەرە دێتەوەو یەكڕاست بۆ ژوورەكەی خۆی دەڕوات، دەگری. كاتێكیش كە بۆ سەر ئاو دەچێت وەكو یەكێك میزە چوڕكێی بێ دەنگی گریانی بەرز دەبێتەوە. دایكه لە خەویش دا، بە دەم خەویشەوە دەگری.

گریانو زاریەكەی پەیوەندی بە پیرییەوە نیە. كاتی خۆیشی كە باوكە گیان میوانی دەهێنایەوەو فەرمانی شێوی دەدا سەدای ناڵە و گریانەكەی لە ژێر زەمینەكەدا دەنگی دەدایەوە، بە ژوورەكاندا بڵاودەبووەوە. لە حەوشەدا دەنگی دەدایەوە.

هەنگێ باوكە گیان ناچار شتێكی بە دیوارەكەدا دەكێشا تا دەنگەكە ببڕێ.

لێ ئەم دەنگە هەرگیز نەبڕاو نەبڕا. باوكەگیان یەكەمجار گرامەكەی فرۆشتو پاشان رادیۆی كڕی. دەنگی بەرز كردەوە لێ گریانو زاریەكە نەبڕاو نەبڕا. دایكه ئەم دەنگەی وەكو ئامێرێكی ئەلیكترۆنی ئۆتۆماتیكی دەگەڵ خۆدا هەڵدەگرت.



كە باوكە گیان لە ماڵ دەردەچوو، گریەو زاریەكە كەمتر دەبوو. گوێچكەی ئێمەش ئیتر گوێچكە نەبوو. پارچە گۆشتێكی نەرم بوو كە بەملاو بەولای سەرمانەوە لكا بوو و كارایی خۆیان لە دەست دابوو.

پاش خانەنشین بوونی باوكە گیان، گریەو زاری دایكه زیادی كرد. لەوە دەچوو مەبەستێكی لە پشتەوە بێ. دەنگی ناڵەو گرین نەبوو. بێزاری بوو. نەفرەتو تووك بوو. دەردو ئازار بوو. وەكو تەزوویەكی كارەبا بوو كە لێت بداتو لە جێوە وشكت بكات. دەنگێكی ناخۆشو ناساز بوو هیچ دەنگێكی دیكە، لە هاتو هاوارەكانی باوكە گیانەوە بیگرە تا دەنگی شوڕە شوڕی ئاوی فوارەی نێو ئەستێڵەكەو پێكادانی بوتڵێن سیفۆنو نۆشابەو پێكەنینو حیلكو هۆڕەكانی پورە مەحبوبە، هاوتای نەدەكردەوە.

باوكە پەنای وەبەر ژێر خانەكە بردو تا كۆتایی هەر لەوێندەر مایەوە. ناڵەو زاریەكانی دایكه لە دەرگاو دیوارەكانو بەدەنمانەوە تێپەڕینو لە خەوەكانیشماندا بەردەوام بوو.

# 10

خراپی کارەکە لەمەدا بوو کە دڵی باوکە گیان ساغ بوو، لاقەکانی ئەرزیان نەدەگرت. مێشکی باش کاری نەدەکرد. زبانی پەڵت بوو بوو، و حەواسی پەرتو پەرێشان بوو. جا دڵی لە نێو ئەم گێروگازەدا وەکو فەرماندەیەك وابوو، کە لە مەیدانی شەڕێکی تەواو بوودا بێهودە نەعرەتەی دەکێشا.

یەکەمجار کە گوم بوو، وەکو هەر شتێك کە یەکەم جاری بێ، باوکە گیان بۆ چەند رۆژێك، ئازیزو خۆشەویست بوو. چیرۆکی گوم بوونەکەیمان بۆ هەموو کەسێك گێڕایەوەو خۆی لە هەموو کەس زیاتر پێی پێکەنی. بەڵام لە دووەمین گوم بوونیا کەس تاقەتی پێکەنینی نەبوو. پیاوێکی لە خۆی پیرتر هێنایەوە بەر دەرگاو بە دەمو زمانێکی گلەیی ئامێزەوە دایەوە دەستمان. پانتۆڵەکەی تەڕ بوو و دەیگوت دابوویە ئەو جادەو بانە.

ئیدی لەوەدوا کەڵکەڵەی دیتنی جادەوبان بوو کە ئەوی لە ژێر زەمینە نیمچە تاریکەکەوە بۆ دەرێ بکێش دەکرد. شەهلا ئەدرەسی ماڵەکەمانی لەسەر پارچە کاغەزێك نووسیو خستیە گیرفانی چاکەتەکەیەوە.



باوکە گیان وەکو پیاوێکی بە شەخسیەتو تەواو سوپاسی شەهلای کرد.

پاشان گوتی ئەو دارەی وێدەین. مەبەستی لە دار، دارعاساکەی بوو، لەبەر دەرگا گەڕایەوەو گوتای بیری چووە ئەو شتەی کە دوو شووشەی پێوەیەو دەیکەنە چاو ببات. مەهین عەینەکەکەی دایە دەستی. قسەکانی بابە گیان مەتەڵێك بوو هەر یەکەمان حەزی دەکرد لە پێش ئەوی تردا هەڵی بێنێ. لێ ئەم عادەتەش زۆر زوو کۆن بوو و مەتەڵەکانی دوا رۆژەکانی باوکە گیان هەرگیز هەڵنەهێنران.

# 11

پوره مەحبوب منداڵی نەبوو، هەندێجار پێویستی بە منداڵێك دەبوو. بۆیە یەكێك لە ئێمەمانانی لە دایكم قەرز دەكرد. شەهلا زۆر لەوە گەورەتر بوو وەكو منداڵ تەمەشا بكرێ. پێدەچوو منداڵی خۆی لەلای پوره مەحبوب كردبێت. مهین زۆر بە نازو نوزو سەركێش بوو. من لە هەموویان لەبارتر بووم.

پوره مەحبوب بەر لە هەر كارێك بۆ گەرماوی دەبردم. دەیخستمە بەینی لاقە سفتو توندەكانیەوەو بە جۆرێ سەری دەشتم وەكو ئەوەی مادەیەكی نەرمی تێدا نەبێ، بە هەموو هێزو قوەتی خۆیەوە سەری هەڵدەگلۆفتم. جلو بەرگەكانی دەگۆڕیمو دەیگوت دایكت بێ سەلیقەو بێ سەروبەرە. لە ماوەی چەند سەعاتێكدا ئەوەندە دەگۆڕام، كە نەمدەزانی چی لە خۆمی تازە بكەم. پورێش ئەمەی دەویست. دەیویست لە رەفتارەكانی پێشووم پاك ببمەوە تا بتوانێ بە دڵی خۆی پەروەردەم بكات. فێری دەكردم چۆن نان بخۆم، چۆن دوای نان خواردن، بە دەنگێ كە ببیسترێ، سوپاس بكەم. چۆن لە تەوالێت دا بە جۆرێ تارات بگرم كە بۆنم لێ نەیەت.

كە لە دەورەی كار ئاموزیەكەم تەواو دەبووم پوره مەحبوب رێی دەدام هەر كاتێ مەیلم لێ بووایە، چەند نوقڵێك لە قاپە نوقڵەكەی سەر مێزی میوانداریەكە بۆ خۆم هەڵگرم.



دەیگوت: "ئێرە بە ماڵی خۆت بزانە".

دەمویست بە ماڵی خۆمی بزانم بەڵام نابوو. ماڵی من نەبوو. هاپۆ قەدیر وەكو پیرە دەرگاوانێك، هەمیشە چاوە نیوەكراوەكانی لە من بوو، شەوو رۆژ نێرگەلەی دەكێشاو تەنیا ئەو كاتە لولەی نێرگەلەكەی لە دەمی دەردێنا كە بیویستایە قسەكانی پوره مەحبوب بسەلمێنێ یان چاوێك لە من، كە هەرگیز باوكانە نەبوو، دابگرێ. دەتگوت ئەگەر لوولەی نێرگەلەكە لە زاری دوور نەخاتەوە، ناتوانێ ئەم كارە بكات.

هەر هاپۆ قەدیر نەبوو كە وەكو نۆكەرو خولام گوێڕایەڵی پورێی دەكرد، خەڵكانێكی زۆر هەبوون كە گەوجانە بە قسەكانی پورێ پێدەكەنینو بە خوتو خۆڕایی سەریان بۆ دەلەقاند.

پورێ زۆر كاری دەزانی، لە داروو دەرمانەوە بیگرە تا فاڵو دوعاو تەلیسمو جادوو. لە كاتی خۆیدا گۆرانیو سەماشی دەزانی. هاوسێكانی دەهاتنە دیدەنی. تەنانەت دایكەش ئەگەر بۆ چەند سەعاتێكیش بووە دامو دەزگای گریەوزاریەكەی لە بەردەم ئەودا دەكوژانەوەو گەنجو شەنگوڵ دەینواند. پورێ بە جۆرێ هاپۆ قەدیری دەتەزاندو تەریق دەكردەوە كە لە چاوتروكانێكا دەگۆڕاو سوور دەبووەوە. كارێكی پێدەكرد كە هەمیشە لوولەی نێرگەلەكەی بە دەمەوە دەگرت و تەنانەت بۆ پشتیوانی و سەلماندنی قسەكانی پورێش سەری بەرز نەدەكردەوە.

پوره مەحبوب دەیتوانی بۆ هەموو شوێنێ بڕوات، دایكە نەیدەتوانی ئەو كارە بكاتو هەمیشە بە عەزرەتەوە بوو. گەڕانەوەی ئەو دەگەڵ گەڕانەوەی باوكە گیان لە سەفەر، فەرقی هەبوو. باوكە گیان هەرچی خاكو خۆڵی جادەوبان هەبوو دەگەڵ خۆی دا دەیهێنا. لە ناوەندی

ژوورەکەدا لێی دەکەوت‌و دەیگوت سەرو سینگی ئاو پرژێن بکەین‌و لاق‌و لەتەری بشێلین، بۆنی ئارەقەی ماڵەکەی پڕ دەکرد. دایکە دەبوا پەڕۆ تایبەتیەکانی ئوتومبیلەکەو ئەو قاپانەی کە دەتگوت سەگ خواردنی تیا خوارد بوو، بشۆردایە.

پورە مەحبوب هەندێ شتی دەگەڵ دەستی خۆیا دێنا کە بۆنی عەتریان دەداو بۆنی دنیایێن نادیار. پورە مەحبوب بەخشندەو نەترس بوو.

"مەحبوب ئازاو سەربەستە" دایکە دەیگوت: "مەحبوب بە دیواری بەرزا سەردەکەوت. کوڕانی گەڕەك لێی دەسڵەمینەوە. وەك من تەمەڵ‌و تەپاڵە ئاسا نەبوو".

یەکەجار کە دەگەڵ پورێ دا بۆ سینەما چووم هاوکات دوو فیلم تەمەشاکرد، یەکێکیان راستەوخۆو بە هەردووو چاوو ئەویتریان بەلا چاوێك. بە تەواوەتی لە هیچیان حاڵی نەبووم. کاتێ کە بۆ دایکەو شەهلام گێڕایەوە، شەهلا لەو فیلمەی کە بە تەواوەتی‌و بە هەردوو چاو دیتبووم حاڵی بوو و دایکەش لەو فیلمەی کە بەلا چاوێك دیتبووم. عەسری ئەو رۆژە پورە مەحبوب بۆ یەکەجار ناردمیەوە.

"حەزم لە هەواڵدزو دووزمان نیە".

دەستی خستە سەر سینە رەق‌و تەقەکەم:

"ژنی دەبێ فێر بێت هەموو شتێك لێرەدا، هەڵگرێ. حاڵی بووی؟"

حاڵی بوو بووم.



# 12

بە ئەمیر دەڵێم "من لێرە ناڕۆم".

"کە من رۆییشتم تۆش مەجبوری بێی. جاکە هاتی هەنگێ دەستی من ماچ دەکەی کە لێرەم نەجات داوی".

دەنگی نەختە نەختە بەرزتر دەبێتەوە، دەڵێی بۆ دە کەس قسە دەکات.

"مانەوەمان لێرە هیچی لێ شین نابێ."

"هێواشتر".

ئاماژە بۆ منداڵەکان دەکەم.

بە ئەسپایی دەڵێت: "لێرە دەمێنیتەوە بۆگەن دەکەی، کەستان ئایندەتان نابێ، نە تۆو نە منداڵەکان. تێ دەگەی؟"

بۆم دەردەکەوێ کە ئەمیر ئەمڕۆ بە نیازە دەگەڵ ئایندەدا کارێك بکات.

"هەموو تەمەنت بە سەفەر ببە سەر، شوکری خوا بکە کە من ئەم دەرفەتەت بۆ دەرەخسێنم. دەرفەتی سەفەر کردن، تاقی کردنەوە، دنیا دیتن، ژیان".

ئەمیر دێتە پێشترەوەو وەکو ئەوەی بخوازێ شتێکی نهێنی بدرکێنێ بە ئەسپایی‌و خۆمانە تر قسە دەکات.

"من لەبەر خۆتمە. ڕەنگە بێیتە ئەویّو ئیتر منت نەویّ. لە من جیا دەبیتەوەو".

چەقەنەیەك لێدەدات "بە دووی ژیانێکی تردا دەڕۆی".

ئایندە لەبەر چاوی ئەمیر بە هەموو شێوەیەك خۆی دەنوێنیّ.

"چ شتێك تۆی لێرە بەستوەتەوە. کام وابەستەیی؟ شەهلا".

ئەمیر دەزانیّ کە ناوی شۆرەتی من‌و شەهلا یەکێکەو باوکە گیان‌و دایکە، باوك‌و دایکمانن. بەڵام تەنانەت ڕواڵەتیشمان لە یەکتر ناچێت.

شەهلا قەڵەوە، لوتێکی یەجگار جوانی هەیە. چاوەکانی فندقییە، خڕۆ پڕ ڕەنگ،و غەبغەبەی بە تۆ بیّ نەبکەی نە بخۆی هەر تەمەشای بکەی. هەمووان دەڵێن شەهلا چووەتەوە سەر دایکە، من کەسێکی ڕەقەڵەی داڵە گۆشتم، کەپووم کە هەمیشە جێگەی باسە، چووەتەوە سەر کەپووی بابم. هەق نیە تەجمیلی بکەم؟ ئەگەر ڕۆژیّ لە ڕۆژان پارەیەکم بێتە دەست تەجمیلی دەکەم. بەڵام ئەگەر پارەم بێتە دەست هەزارکاری لەوە زەروریترم لە پێشە.

شەهلا وەستاو مامۆستای پێشنیازانە.

"بەر لە تەجمیل باشتر وایە چەند دەستە جلێك بۆ خۆت بکڕیت‌و ئەم جلانەت کە یەژی جلکی سەردەمی ساسانیانە فڕیّ بدەی"

ئەمیر دەڵێت:

"ئەم ڕەفتارانەت وام لێدەکەن پێت بڵێم ورچی قوتیی. تۆ لە گۆڕان دەترسیت. لە جوڵان دەترسیت. وەستاون‌و مانەوەت پیّ خۆشە. وا دەزانی دنیا بە هەمان شێوەی کە تۆ دەتەویّ دەمێنێتەوە. باشە ئەم شێوەیەی



باشە؟ وەڵام بدەوە. باشە؟ هێندە سەرت کردۆتە قاوغەکەی خۆتەوە، بیرت چووەتەوە ژیانێکی دیکەش هەیەو ئەمە ژیان نیە کە تۆی تێدای".

ئەمیر ئەو ڕۆژەی کە باوەڕی بە ژیانێکی دی پەیدا کرد من لە کویّ بووم؟

"مهین کە گەوهەری یەك دانەی دایکت بوو، بیّ ئەو هەڵی نەدەکرد، لە شەقەی باڵی داو ڕۆیی. کەچی تۆ".

ئەمیر چاك دەزانێت من وابەستەی دایکم نیم. دەتوانم بە مانگ نەی بینم‌و هەر بە خەیاڵیشمدا نەیەت. لیّ نازانێت کە هەمیشە بیر لەو دەکەمەوە. نازانێت کە ناتوانم بیر لەو نەکەمەوە. نازانێت کە دایکم بۆ من لە حوکمی ڕازو نهێنییەکدایە.

دەڵێم: "باسی ڤیتامین بکە".

ئەو پڕتەقاڵەی کە دایکم دەیخوات، دەبیّ ترش بێت وا بەم جۆرە دەم و زاری کرژ دەکاتەوە. بە سەرسامی دەڵێت:

"باسی ڤیتامینی پڕتەقاڵ؟"

"نە، باسی ڤیتامینەکەی باوکە گیان".

غافڵگیرم کردووە. چاك دەزانێت کە نامەویّ گوێم لە ئەسپیّو ڕشك‌و کرێژە سەرو هەزارو یەك دەردی بیّ دەرمانی دیکە بێت، گوێم لە باسی ئەو ئاوە بیّ کە لە ڕێگەی دوورەوە دەیهێنن، گوێم لە باسی شەوانی ساردو ئاگری کوانوو کە هەڵکردنی خێر بوو.

دەزانیّ کە هیچ دڵم بە باسی گەرماوێن پیس‌و گەرەکێن قوڕو قوڕاوی‌و تاك‌و تەرا ترومبێلی سەر شەقامانی ئەوان ڕۆژانەوە نیە.

"مالاوا. من بیرم نیە دوێنێ چیم خواردووە. دەتەوێ گۆڕت بۆ هەڵدەمەوە".

حەز دەکەم پێی بڵێم کە گۆڕەکانی دەرونی من کراوەن، خۆڵم بەسەریاندا نەکردووە. مردووەکان ڕاست ڕاکشاونو چاوانیان کراوەیە.

دایکم دەبێ قسە بکات. ئەگینا چۆن بزانم کە بۆچی ئەو شەوە نە چووە خوارێ. بۆچی وەکو مردوویەك بە چاوی کراوەوە ڕاکشاو بە سەعاتان لەو تاریکییەدا بەبێ جوڵە مایەوە.

پورە مەحبوب دەڵێت:

"من تەنیا لە خۆشی ماتیك شووم بە جەعفەر کرد".

جەعفەر مێردی یەکەمی بوو.

"گوتیان تا شوونەکەی بۆت نیە ماتیك لە لێوت بدەی".

دایکم نازانێ لە خۆشی چیو لەبەرچی شووی بە باوکە گیان کرد.

"ڕۆژێك منیان دایە باوکت. وام بیر کردەوە کە دەبێ باوکی دووەمم بێتو پێویستە لە ئێستا بە دواوە کیژی ئەو بم. یەکێك سیخورمەیەکی بە کەلەکەما کێشاو گوتی: باوکت نیە. مێردتە. لەوە بە دواوە هەر کاتێ سیخورمەیەکم پێدا دەدرا دەمزانی کە شتێکی گرینگ روویداوە".

ئەمیر دەڵێت:

"من کە تۆم هێنا هەر یەکەم ڕۆژ پێم گوتیت من ڕەفیقی ڕێم گەرەکە نەك بەردی سەر ڕێ".

بیرم نایەت کە ئەمیر باسی ڕێی کردبێت.

"پێویستم بە یارمەتیە، بە ورە بەرزکردنەوە. بە هاوکاریە. دەنا دنیا پڕە لەو خەڵکانەی کە تەنیا خوێندنەوەی ئایەتی نائومێدی دەزانن".



دەستم دەگرێتو هەڵم دەستێنێ.

"ئەدی بۆ ئەم ورگە ناچێتە ناوەوە. ها؟ حەز دەکەم تۆ لەوێ بە شێوەو هەیئەتێکی تازەوە بدینم."

دەستی لە قەدم دەئاڵێنێو بە ڕیتمو سەدایەکی هێدیو هێواش دەڕەقسێو لەگەڵ خۆیدا بەملاو بەولادا دەمباو دەم هێنێ.

"سەفەر روحمان تازە دەکاتەوە. خەڵکانی تازە دەبینین. دۆستانی تازە پەیدا دەکەین. خۆمان دەگۆڕێین."

ناکرێ بەدەم سەمای دوو قوڵییەوە بپرسم کە چۆن دەگۆڕێینو بە چ شتێك دەگۆڕێین. ئەمیر بە کاوەخۆ سوڕم دەدا. چەند نەرمو نیانو میهرەبان بووە. چەند دەنگی نەرمە. چاوەکانی دەنوقێنێ. من ناتوانم ئەم کارە بکەم.

دەبێ چاوانی یەکێکمان کراوە بێ تا کورسیو دەستکارەکانی شاهین کە لەو گۆڕەنو فریا نەکەوتووم کۆیان بکەمەوە، نەکەینە ژێر دەستو پێوە. حەسوودیم بەو دێت کە دەتوانێ بە نوقاندنی چاوەکانی چارەنووسی خۆی بگۆڕێتو وا وێنا بکات لە جێیەکی باشتردایە.

دەڵێم: "وای ببورە".

پێم بە پێیدا ناوە.

# 13

ئەو تەلارە گەورەیەم کە ئەمیر نیوەی تەمەنی تیا بەسەر دەبات، دیتووە. هەروەها خەڵکەکەشیم دیتووە. دەماریان دەناسم. ئەخلاقیان دەناسم. دەزانم کێ منداڵی هەیەو کێ نیەتیو خەتا لە ژنەکەیە، یان لە پیاوەکە. دەزانم کێ تورکەو کێ ئەسفەهانییە؟ کێ رژدو چروکەو کێ دەستو دڵ کراوەو تێرە. کێ ئاڵۆزەو کێ سادەو ساکارو بێ فڕو فێڵە.

ئەمیر کە قسەیەك دەگێڕێتەوە، دەزانم ئەو قسەیە هی کێیەو لە زاری کێ دەرهاتووە. کە نوکتەیەك دەگێڕێتەوە، دەزانم کێ گێڕاوێتەوەو کێ لە هەموو کەس زیاتر پێی پێکەنیوە.

ئەمیر دەچێتە بنجو بناوانی خەڵکییەوەو منیش هێدی هێدی بە دووی ئەودا دەڕۆم. ئەمڕۆ بە حوسەینییەوە گرتوویەتیو حیکایەتێکی تازەی پێیە.

"ژنەکەی حوسەینی خیانەتی لێدەکات."

"مەنیجە؟" قەندەکە دەپەڕێتە قوڕگم "نا، باوەڕ ناکەم".

"کە خۆی باوەڕ دەکات تۆ چ کارەی تا باوەڕ نەکەی؟"

"تووشی وەهم بووە."

"منیش وام پێگوت. دەزانی چی وت؟"



گڵۆپەکە دەکوژێنێتەوە

"ئێ، بڵێ".

"کابرای لەندە هور سوور بووەوە. تووڕە بوو و گوتی کاشکێ تووشی وەهم بوایەم."

ئەمیر رووم تێدەکات:

"بەڕای تۆ حوسەینی لە چی کەمە؟"

"چۆن؟"

"ئێوەی ژنان دەبێ باش یەکتر بناسن، دوو کیژی میناکی چەپکە گوڵ. ماڵو خانووی جوان. حوسەینیش بەستەزمانە هەموو ژیانی خۆی وەقفی ماڵو منداڵەکەی کردووە. کەچی بەو حاڵەشەوە ئەم ژنە گەوجە..."

کەمێك کێژ بووم. هیچ شتێك ناڵێم.

دەڵێت: "دەزانی بەیانیان یەکەم کاری چییە؟ دێت تەلەفۆن هەڵدەگرێتو تەلەفۆن دەکات. تاکو ئەمڕۆ وامدەزانی بۆ دایەرەیەك، بۆ شوێنێ تەلەفۆن دەکات. چونکە هەرچەند دەقەو جارێك تەلەفۆنی دەکردەوە. ئەمڕۆکە زانیم ئەو نەگبەتە بۆچی دوای هەر تەلەفۆنێك چەند جگەرەیەك بەبادا دەدات".

"ئێ؟"

"حاڵی نەبوویت؟ ئەو بەستەزمانە هەر تەلەفۆن بۆ ماڵەوە دەکاتو هەر مەشغوڵە".

دەڵێم: "هەر ئەوە؟"

"ئەوە کەمە؟"

"ئاخر مەشغوڵ بوونی تەلەفۆن نابێ بە بەڵگە".و بیر لە مەنیجە دەکەمەوە، کەسێکی کەم دوو و خەمینە.

"حوسەینی تەقریبەن دڵنیایە، کە ژنەکەی خیانەتی لێدەکات".

ئەمیر غافڵە لەوەی کە رۆژی سەد کەڕەت خیانەتی لێدەکەم، کاتێ کە بیجامەکەی بە هەمان دەقەوە کە دایکەندووەو لە ناوەندی ژوورەکەدا کەوتووە. کاتێ کە لە نێو خەڵکی دا ئەوەندە سەری قاڵە کە ئاگای لە من نیە. کاتێ تێر بووەو بیری دەکەوێتەوە کە چاوەڕوانی ئێمەی نەکردووە. کاتێ من بە سەبەبکاری ناکامیەکانی خۆی دەژمێرێ. کاتێ ژنێکی دی بە رووی منا دەدات. کاتێ کە دەتوانێ بە تەنیا لەزەت لە هەر شتێك ببینێ. کاتێ کە بە تەنیا جێم دێڵێت، خیانەتی لێدەکەم.

هەندێجار تووشی نا ئومێدیو نیگەرانی دەبم. تۆبە دەکەم. دەگەڕێمەوەو قامکەکانم بە ژێر قژەکەیا دەکەم. سەری دادەنەوێنێ تا قامکەکانم تا پشت ملی بێنەخوارێ.

"خێرە؟"

بە روویا هەڵدەشاخم "دەفەرموو، کە مجامەلەی ناکەی دەڵێ خێرە؟ کە مجامەلەشی دەکەی هەر دەڵێ خێرە، کەری کێ تۆپیوە؟"

ئاگادار نیە کە رۆژێ سەد جار خیانەتی لێدەکەم. رۆژێ سەدجار لەم ژیانە دەچمە دەرێ. بە ترسو لەرزو دوو دڵی ژنێکەوە کە هەرگیز لەماڵ دوور نەکەوتووتەوە. هێدیو هێمن، کڕوکپ، بە بێدەنگیو بەوپەڕی نهێنی بۆ شوێنانێ دەڕۆم کە ئەمیر بە خەیاڵیش پەی پێ نابات. هەنگێ بە پەشیمانی ژنێکی تۆبەکارەوە، لە تاریکی شەوێکی وەکو ئەمشەودا بۆ ماڵەوە، بۆ لای ئەمیر دەگەڕێمەوە.



## 14

شاهین لە حەوشە چکۆلەکەی پشتەوە زندانیە. کاتێ دێتە دەرێ دەزانێ ئەگەر حەزی لە بیجامەکەشی نەبێ دەبێ هەر لە پێی بکاتو بە رووتی لە ماڵەوە نەسوڕێتەوە.

دوو دانە سەعات تێ پەڕیوەو شاهین هێشتا نەیزانیوە کە شازادە نیە. کوڕی خانەوادەیەکی دەستکورتە.

ئەمیر سەر دەنێ بە شوشەی حەوشە چکۆلەکەوە "بۆچی من حەز دەکەم هەموو رۆژێ لەگەڵ گەردی بەیانی دا هەستمو بۆ ئەو، بۆ ئەو ژینگە بۆگەنە، بۆ ئەو بۆگەنخانەیە بڕۆم. چما پێم خۆشە گوێڕایەڵی مودێرێك بم کە هیچ شتێك نازانێ".

ئەمیر دیسان بیری کەوتووەتەوە کە چ شتانێکی لەم ژیانەدا خۆش ناوێ. ئەگەر شاهین بشتۆرێ دەتوانێ بێت شێوەکەی بخوات، لێ لەوێندەرەوە هاوار دەکات "من ئەو بیجامەیە لەبەر ناکەم".

ئەمیر بیجامەکە هەڵدەگرێتو تەمەشای دەکات.

"دڕاوە؟ کۆنەیە؟"

شاهین دەڵێتت: "رەنگەکەیم بە دڵ نیە".

شادی بیجامەیەکی تری بۆ دێنێ.

شاهین هاوار دەکات "مۆدێلەکەیم بەدڵ نیە".

ئەمیر دەکێشێت بە تەوێڵی خۆیدا "وای وای".

شاهین بە پێڵاوەکانی، بەکراسەکەی، بە سەعاتەکەی، بە قژی، رازی نیە.

شادی هەڵدەداتێ "باشە، حەزی لێ نیە. خۆ بە زۆر نیە، وازی لێ بێنە."

ئەمیر دەچێ بۆ حەوشە چکۆلەکەی پشتەوە، شانی شاهین دەگرێو بۆ ئاسمان بەرزی دەکاتەوە.

بە ئەسپایی دەڵێم "وازی لێ بێنە"

ئەمیر وازی لێ دێنێو لەسەر سفرەکە دادەنیشێت. شیوەکە سارد بووەتەوەو کەس حەزی لێ نیە بیخوات.



# 15

لە دوای (شادی)م. لە گەراجەکەدا نیە. خۆم بە راڕەوە تەنگەکەی عەمارەکاندا دەکەم. خۆی داوەتە پەنای دەرگای دوا عەمارو لە نێو تاریکیەکەدا بە ئەستەم دەبینرێ.

"ئەوە لێرە چ ناماقوڵیەك دەکەی؟"

دەنگم بەرزە. قامکی دەخاتە سەر زاری.

"وس ، ئێستا ئایدا دەمدۆزێتەوە".

هاوار دەکەم کە ملی بشکێنێو بڕوات گوم بێ.

"یاڵلا وەرە دەرێ."

چاوەکانی کراونەتەوە. دەچێتە دواترەوە. خۆی دەداتە پەنای بارە شتەکان. ئاماژەی دەرێ دەکەمو دەڵێم کە بڕوات گۆرێ گوم بکات. سەدام لە راڕەوەکەدا دەنگدەداتەوە. شادی دەمو لێوی هێناوەتەوە یەكو چاو لە من ناگوازێتەوە. بیرم چووە کە وەکو دێوێك رێم لێی گرتووە. پێویستە بڕواتە دەرێ.

شادی کوشتەو شەیدای چاوشارکێو خۆشاردنەوەیە. عادەتی وایە خۆی بخزێنێتە ژێر مۆبیلەکان. لە پشت تەختەکانەوە کزکۆڵە بکات.

بچێته نێو کۆمەدی نوێنەکانەوە. ئەو رۆژەی کە بارمان کرد لە نێو کەلوپەلەکاندا ون بوو. گازم کرد.

"لە کوێی؟"

هێشتا شارەزای پەناو پەسێری ماڵەکە نەبوو بوو.

گوتی: "خۆیشم نازانم".

پێمگوت کە لێرە بچێتە دەرێ. بەر لەوەی بەجۆرە جێیانە رابێ، بەر لەوەی کە بۆنی ژێر زەمینەکە بە مێشکیا بچێ‌و لەوێندەر بمێنێ، لێی نزیك دەبمەوە. شانی دەگرم. بۆچی قسە ناکات؟ مەگەر لەگەڵ ئەوم نیە.

لال بووە. دەنگێکی خەفە لە زارییەوە دێتە دەرێ. چاوانی ترسیان لێ نیشتووە. گریانی بێدەنگ باش دەناسم. گریانی بێدەنگ واتا کە ناتوانێ لێرە بڕوات. بە چیچکانەوە دادەنیشم، سەرم دەخەمە نێو هەردوو دەستم، حەز ناکەم کچەکەم لە من بچێت. بێزارم لەوەی کە من لە دایکە یان شەهلا بچم. قەت رۆژێ لە رۆژان بە تەمای لێکچوون نەبووم. بەلام خەڵکانی دی ئەمە دەدۆزنەوەو حازرو ئامادە پێشەکەشتی دەکەن. نامەوێ شادی هەمان رەفتاری من دووبارە بکاتەوە.

من دەترسم لە تاریکی، لە ژێر زەمین، لە سێبەر، لە سێبەرو تارماییان. لە هاپۆ قەدیرو تەنانەت لە دایکەو پورە مەحبوبیش. بۆیە فزەم لێوە نایەت، دەنگم دەرنایەت. سەد جۆرە بیانووم دەدۆزییەوە بۆ ئەوەی نەبینرێم. هێواش هێواش لە چاوی خۆیشم پەنهان بوومو رۆژێك ناچار بووم لە خۆم بپرسم کێم. بەم چاوشێرکانی‌و گومگمۆکێیەوە گەورە بووم. گومگمۆکێیەکی قوڵی ئەوتۆ کە نە دۆزینەوەو نە ئومێدی دۆزینەوەی لە دوا نەبوو. لێ شادی لە چ شتێك دەترسێت؟



بە کرێ دەخزێ‌و بەلاما رەت دەبێ، بە هەمان دەقەوە وەستاوم. کە دەچینە سەرەوە، شادی وێنەی من دەکێشێت، دوو شاخی گەورەی بۆ دروست کردووم، دانەکانی لە شێوەی شفرەی بەرازدا دروست کردووم. هەر کاتێ هاواری بەسەرا بکەم یەکسەر ئەم وێنەیە دەکێشێت‌و بە کرێ لەسەر رێگاکەمی دادەنێ. بۆ ساتێك خۆم لە بیر دەکەم‌و بیرم دەچێت کە لەو کاتەی رۆژدا لەوێ دانیشتووم.

بنی پێیە خاوسەکەم مێروولە دەکات. هەستدەکەم مێروویەك لە کونی نەعلەکەمەوە چووەتە ژوورەوە. لە جێی خۆم رادەپەڕم. شادی لە نزیکمەوەیەو بە قامکی لە کونی نەعلەکەمەوە ختوکەی پێم دەدا. دەستی بۆ دەمم بەرز دەکەمەوەو ماچی دەکەم. خۆی بە شانو ملما دەداتو دەگری. ئایدا لەبەر راڕەوی عەمارەکەی ئێمەدا وەستاوەو هاوار دەکات!

"شادی خانم! ئاقیبەت دۆزیمیتەوە".

## 16

هیچ لەزەت لە فێنکی کولەرەکە نابینم، چونکە ئەمیر مەجبورە لە ژێر هەتاواو لەبەر گەرمادا کار بکات. دوای فراڤین سەر خەوێ ناشکێنم، چونکە ئەمیر دەرفەتی ئەم کارەی نیە. هاتوچۆی دۆستانم ناکەم، چونکە ئەمیر ناتوانێ کاری وا بکات. ئەمیر کۆیلەیە. کۆیلەیەکە، کە هێزی کاری بیست ساڵی داهاتووشی فرۆشراوە، ئەمیر تا بیست ساڵی دیکە قەرزاری بانقە. بانق هێزی کاری ئەوی کڕیوە. ناشێت شانو ملو سەروچاوی ئەمیر لە ژێر هەتاوا بسووتێتو تاوەگاز بێتو دەموچاوی من لە تێر خەویو تێر خۆراکیدا ببریقێتەوە. ئەمە کارێکی ڕەواو دادپەروەرانە نیە. ئەمیر عەودالی دادپەروەریەو لە هیچ شوێنێکدا پەیدای ناکات. منداڵەکان دەیکەن بە هەراو پێکا هەڵەشاخین. ئەمیر دەڵێت بە ئێمەوە، بەم ژیانەوە بەستراوە. تاکەی؟ تا کۆتایی تەمەن.

ئەمیر پارە دێنێو ئێمە خەرجی دەکەین. ئێمە سەرفکەرین. دەڵێم "دەچم کار دەکەم پێشتریش کارم کردووە. دەتوانم".

"تۆ ئەگەر ڕاست دەکەیو دەتوانی منداڵەکانت باش پەروەردە بکەو تەربێت بدە."



شاهین لە شادی دەداتو شادی تفی لێدەکات.

"دەفەرموو".

دەڵێت: "تاقە ڕێی ڕزگاریم، ڕۆییشتنە".

"ئەگەر بچیتە ئەوێندەرش هەر کۆیلەو ڕەنجبەری".

ئاڵای شەرم هەڵکردووە.

"ڕاست دادەنیشێت "دەشێت بفەرمووی بۆچی؟"

"چونکە بە کۆیلەییو ڕەنجبەری هاتویتە دنیا، باوکت کێ بوو؟"

دەبێ خراپ لە پرسیارەکەم حاڵی بووبێ بۆیە هاوار دەکات:

"باوکی من کەسێکی زەحمەتکێشو ئابڕومەند بوو. بەڵام باوکی تۆ".

دەیەوێ باوکی من بێنێتە ناو ناوان. خۆم لە قسەکەی هەڵدەقورتێنم "یانی زەحمەتکێش بوو یان کۆیلە؟" لێ وەڵام ناداتەوە. ئەو شتەی دۆزیوەتەوە کە بە دووی دا دەگەڕا، باوکی من.

چاوەڕوانم دەرەجەی غیرەتم بێتە کوڵو جۆش. ئەمیریش چووە بە قیناو دەزانم تا نەمگەیەنێتە ئەو خاڵە دەست بەردار نابێت. ئیدی سەبرم سوا. ناچار دەبم دەست بەکاربم.

دەڵێم "بابم هەر چیەك بوو، مایەی شەرمەزاری نەبوو".

هەڵوەستەیەك دەکەم تا کاریگەری جەزرەبەی دواترم زیاتر بێت.

"لە بیرتە دەتگوت کاتێ باوکت بۆ قوتابخانەکەتان دەهات لە شەرمەزاری دا دەبووی بە قەترەیەك ئاو".

باوەڕی نەدەکرد بەو شێوە بێ شەرمانەیە ئیعترافە ڕاستگۆیانەکەی بدەمەوە بە چاویا. نازانێت کە ئامادەم سەد جار باوکی چوارشانەو قۆزم

به باوکی شڕو شەپڕێوو پەرێشانی ئەو بگۆڕمەوە. ئەگەرچی تازە درەنگە. ناشێت مردووان ئاڵوگۆڕ بکرێن.

سەری بادەدا. دەزانم نەفرەت لە سادەیی و ساکاری خۆی دەکات. کارێکی وام کردووە کە راستگۆییەکەی، وەکو گەوجێتیەکی ڕەها بێتە پێش چاو.

دەڵێت: "باوکی تۆ تەنیا لەیەك شتدا بلیمەتو وەستابوو، لە خەڵەتاندنو لە ڕێ بەدەرکردنی ژنانی خەڵکی دا".

ملیشی سوور دەبێتەوە.

دەڵێم: "هەرچی فیلمی جان ئەنگێزی دنیا هەیە لەسەر ئەو بناغەیە ڕۆدەنرێو دروست دەکرێت".

دەزانم کە تەواو کەر بووم. داینەمۆی شەڕو قەرقەشە کەوتووەتە کار. هەندێجار خۆیشت بکوژی، فایدەی نیە، شەڕەکە بە پەلە دەچێتە پێشێو بە هیچ لوژێكو تەگبیرێك ناتوانی بەردەمی بگریت. قسەیەك لەو قسەیەك لە من. ئەو دەڵێ سیر من دەڵێم پیاز. بەرگری لە شتێك کە باوەڕت پێی نەبێ، هیچ لەزەتێکی نیە. ئەمیر ئەم ئەرکەم بەملدا دەدا. رقم لێی هەڵدەستێ. کارێکی وەها دەکات کە هەست بکەم پیرەژنێکی کرێتو دزێوم. کەواتە بۆچی کرێت تر، ناشیرینتر نەبم؟ ئەمیر گوڕی بەستووەتەوەو وازم لێ نایەنێ، بە قسەکانی خۆی جۆش دەسەنێ. دەگەینە ئاستێك کە من دەبێ هاوار بکەم.

دوای ساڵانێکی زۆر ئەوجا بۆم بە دیار کەوت کە یەك هاوار بەرانبەر بە سێ سەعات تکاو نەرمکێشییە. بۆم بە دیار کەوت، کە یەك هاوار لە هەورە تریشقەیەك دەچێ، کە بە جارێ هەموو شتێك بسووتێنێ. دوای



ساڵانێکی فرە ئەوسا بۆم بە دیارکەوت کە بەشەر پێویستیان بە هاوار، بە دەنگێکی بەرزە تا لە کاتی پێویستدا ناچاری گوێگرتنو بیستن ببنو دەنگە ناسازو بە ئازارەکانی دەوروبەریان گوم بێتو بڕەوێتەوە. بۆ ئەوەی بیریان بکەوێتەوەوە خەڵکانی دیکەش لە بەرانبەریاندا دانیشتووە. هاوار دەکەم، هاوارێکی بەرز، بتەو. بەبێ ئەو ئاهو گریەیەی کە ئەمیر نێوی ناوە مەکری ژنانە. دەزانم کە جوجکخۆر خۆی گەیاندووەتە پشت دەرگاکەو خانم هاشمی تا ناو قەدی لە پەنجەرەی سەر حەوشەکەی پشتەوە هێناوەتە دەرێ.

ئەمیر دەڵێت: "دەنگت نزم بکە".

نزمی ناکەم. هەڵدەستم تا دەنگەکە باشتر بڵاوبێتەوە.

خۆشحاڵم کە خانووەکەمان بچووکەو ئەو ناتوانێ لە دەستی هاوارەکانم هەڵێت.

بە ئەسپایی دەڵێت "تەڵاقت دەدەم."

وەکو تیری خەلاسێکە کە زۆر بە ئارامیو خوێنساردی دەیهاوێ.

من دەبێ بمرم. پێویستە بمرم. ڕاکشێمو لە جێی خۆم بمرم. ڕادەکشێم بەڵام نامرم.

# 17

ئەو ژێر زەمینەی کە لە خەونەکاندا دەیبینم پەنجەرەی نیە. بەڵام ژێر زەمینەکەی ماڵی باوکەگیان پەنجەرەی هەبوو، چوار پەنجەرەی نزمو بچکۆلە. ژێر زەمینەکەی ماڵی پورە مەحبوب تەنیا یەك پەنجەرەی هەبوو، کە لە حەوشەوە دەبینرا. ژێر زەمینەکەی ئێمە گەورە بوو، پڕ بوو لە شتە کۆنەو بۆشکەی نەوتو دەبەی ترشیات.

کە لە قاڵدرمەکانەوە دادەگەڕایتو دەهاتیتە خوارێ لە پێش هەموو شتێکدا چاوت بە حەوزی گۆشەی ژێر زەمینەکەو ئەو سەندوقۆکانە دەکەوت کە دەستەوارە نانی لەواشەیان لەسەر هەڵچنی بوون. میچی ژێر زەمینەکە نزم بوو. لە هەر شوێنێکەوە کە سەفەر بۆ ڕابردوو دەکەم دەگەمە ئەم ژێر زەمینە، ئەو ژێر زەمینەی کە بە دالآنانی یەك لە ناو یەکدا دەچێتەوە سەر ژێر زەمینەکەی ماڵی پورە مەحبوبیش.

باوکە گیان پاش تامپۆنی لۆریەکەی، بە باقی دەستمایەکەی تەکسییەکی کڕیو خانەنشین بوو، باوکە خانووەکەی باش نەدەناسیو کە ناچار بوو لە ماڵەوە وەمێنێ نەیتوانی وەکو ئەوسای کە لە ماڵ دوور بوو، دەستی پێوەی بێو پارێزگاری لێبکات. ماڵەکە پڕ بوو لەو سێبەرو تارماییانەی کە ئەو دەگەڵ خۆیدا دەیهێنان، لەو سێبەرو تارماییانەی



کە کاتێ هاپۆ قەدیر گوڵە باخە گەورەکەی حەوشەیانی بڕییەوە، لەسەر دیوارە سپییەکەیدا قووت بوونەوەو پەیدا بوون. غەرقی تەمەشای جمو جۆڵی کڕوکپو بێدەنگی ئەوان (سێبەرو تارماییەکان) بووم.

تارمایی بێ نموودو کاڵی نەفەرێك بەسەر دیوارەکەدا دەڕۆییو تارماییەکی دیکەش کە لەو جیاواز بوو، دەردەکەوتو لە چاو ون دەبوو. پاشان گەورە بوونو لە نزیکییەوە وەستان. سایە گەورەترەکەیان سەری نەبوو.

دنیا لە خەوا بوو. تارماییەکان لەسەر دیوارەکە دەڕەقسین. بە هەڵە بە ڕۆحم دەزانین، دەگەڵ ڕۆحدا تێکەڵم کردبوون. سەرم وەبن لێفەکەدا دەکردو پاشان بە ئەسپایی لێفەکەم لا دەدا. نیوە ئاخێزێکم بۆ دەکردو تەمەشام دەکردن. بێدەنگیەکە، لە کێشا نەبوو. دەترسام هاوار بکەم. سووچێکی لێفەکەم بە دانم دەگرتو نەمدەتوانی چاو لە دیوارەکە هەڵگرم.

تارماییە گەورەکە، تارمایی یەکەمی بە تەنی خۆی داپۆشی، وەکو پەڵە هەورێکی سخو چڕ کە بە تەواوەتی بەری ئاسمان بگرێت. پاشان بۆ دواوە ڕۆییو تارماییە بچوکەکە لێی نزیك کەوتەوە، تارماییەکە ئەمجارەیان سەری هەبوو، و تارماییە چکۆلەکە لە کەفلەکونێکا وەکو بنیادەمێکی زگ زلی لێهات، کە سەرێکی بەسەرەوە رووا بێ. تارماییەکان دەجولانو ئێستا بازوویەك لە نێو ئاپوڕا پێکەوە گرێخواردووەکەیانەوە هاتبووە دەرێ. تارماییەکان درێژ بوونەوەو نیوەیان سەرکەوتنە سەر دیوارەکەو پاشان کوتو پڕ وەکو پەردەیەکی ڕەشو

تاریك لە دیوارەكە كەوتە خوارێ. بوو بە گردۆلكەیەكو دوای تۆزێك وەكو خەیاڵو سێبەرێكی گوزەرا مەحو بووەوە.

تارماییو سێبەرەكان هی هەر كێیەك بوون، ئێستا هی منن. خاوەنەكانیان ئاگایان لێ نیە كە تارماییو سێبەرێكیان هەبووەو ئاگایان لێ نیە كە سێبەرو تارماییەكانیان-م لەسەر دیوارەكە هەڵگرتووەو حەپسم كردوونو دەگەڵ خۆمدا بۆ هەموو شوێنێكیان دەبەم. هەندێجار بەدەر لە زەمانو زەمین ئالودەو گیرۆدەی گەمەكردن دەگەڵ ئەوانا دەبم. ئەمجارەیان بەبێ ئەو ترسو واهیمەیەی كە هەموو شتێك تەرە دەكات. لە خەیاڵمدا هەموو شتێك شەفافە، و بێدەنگییەكەی شەو قووڵو مەندو ئاسوودەیە.

كشانو ڕاخوشینی تارماییەكان بەرەو یەكتر نەرمو خەیاڵ ئەنگێزە، تەڕیو تازەیی سروشتو تەبیعەتی هەیە، هەندێجار لێیان بێ تاقەت دەبم. دەخوازم بۆ خاوەنەكانیان بگەڕێنمەوە، لێ تازە كار لە كار ترازەوە، ئەو كارە مەحاڵە، خودانی راستەقینەیان ناناسم.



# 18

ئەمیر ئاشق بووە. ئاشقی ژنێكی قژ زەرد. بە منی دەناسێنێت "خوشكمە". ژنێكی داڵەگۆشتی قەڵەمییە، لەگینە كەنەدایی بێت. دەستی بەرەو من دێنێو بزەیەك دەكات. مرۆڤ بۆی جیا ناكرێتەوە ئێرانییە یان كەنەدایی. لێ غەریبە. خوشكی نیە.

دەمەوێ هاوار بكەم، لێ ئەمیر تەمەشای من ناكات. ئاوڕی بۆ لای ژنەكە داوەتەوە. كەس ناتوانێ بەو جۆرە تەمەشای خوشكی خۆی بكات. ئیدی خەریكە دڵنیا دەبم. پێڵوەكانم توند دەنێمە سەریەك، چرچ دەكەوێتە ڕووم. لە دڵی خۆدا دەڵێم تەواو. هەست بە غەمێك دەكەم كە لە هەموو خەمەكانی تر جیاوازە. گوێم لە دەنگیناڵەو گریەی خۆمە. وەكو دەنگی دایكەیە.

بە دەنم بەر بەدەنی دەكەوێ، چاوەكانم نەكردونەتەوە بەڵام لە خەو هەستاوم. پێدەچێ نزیكی بەیانی بێت. ئەمیر هاتووەتە ناو جێگاكەم. باسكم لە قەدی دەئاڵێنمو سەرم دەبەمە ژێر ملی.

ئاشتبوونەوەیەكی كپو بێدەنگ، باشترین ئاشتبوونەوەی سەر رووی زەوییە. ئەمیر دووبارە لای منە، ئاگای لەوە نیە لە دەستی كێم سەندووەتەوە.

## 19

دووەمجار کە پورە مەحبوب بۆ ماڵی خۆمانی ناردمەوە، بۆنی میزم لێدەهات. شەوێ میزم بە خۆدا کردبوو و پورە مەحبوبیش لێم بێزار بوو. دایکە پێی گوتم کە بچمە ژێر زەمینەکە تا خۆی دێت. خۆشحاڵ بووم، کە بۆ ماڵی خۆمان گەڕابوومەوە. چارەی پورە مەحبوبم نەدەویست. لە هاپۆ قەدیرو چاو داگرتنەکانی دەترسام. لە خەونمدا دەبوو بە کولەحاجیەکو داریکی بە دەمەوە بوو بەرەو من دەهات. ئەمجارەیان هاپۆ قەدیر لە سێ حاڵەتا نەی قلیانەکەی (لولەی نێرگەلەکەی) لە دەمی دەردێنا. کاتێ کە دەیویست مەرایی پورە مەحبوب بکات. کاتێ کە دەیویست چاو داگرێت‌و کاتێ کە دەیویست من چای بۆ تێبکەم‌و ئەو لەو کاتەدا کە چایەکەی بۆ دەبەم مەچەکی دەستم بگرێت‌و هەناسە دوکەڵاوییەکەیم بەسەرو روودا بکات.

"هاپۆت خۆش ناوێ؟"

"خۆشم دەوێ".

چاوێك دادەگرێت

"ئەدی بۆ هەڵدێی؟"

"کوا هەڵنایەم."



هەنگاوێك دەچوومە پاشەوە. دایکە شێرەی ئاوەکەی کردەوە. گوتی کە خۆم رووت بکەمەوە. دایکە بەدەم خوتەو بۆڵەو ناڵەو زارییەوە جنێوی دەدا. نەمدەزانی ئەو جنێوانە بەکێ دەدا، لێ فێر بوو بووم لە جۆری جنێوەکانا بزانم کە دەگەڵ کێیەتی‌و مەبەستی کێیە. سۆندەی ئاوە ساردەکەی لەسەر لاقو لەتەرم ڕاگرت. لەشم وەکو پێستی مریشك پیرەڵۆك بوو و کەوتمە لەرزین. جنێوەکەی دایکە بۆ باوکە گیان بوو، ئەوسا نۆرە هاتە سەر باوکو دایکی خۆی. پورە مەحبوبیش بێبەش نەکرا.

"بکەوە سەر چیچکان، دەی."

بەدەم جنێوەوە یەکێکی بە پشتمدا کێشا. لە ژێر ئاوە ساردەکەدا وەکو قورباقە هەڵبەزیمەوە. لەشم لە سەرما وەکو یەکێك کارەبا گرتبێتی هەڵ لەرزی. گریام. دایکە ئازای سوور کردمەوە.

"زیرە کوشتووی، چەپەڵی بێ دەسەڵات."

نەمگوت کە لە هاپۆ قەدیر دەترسام کە من چووم بەسەرا هاپۆ قەدیر جانتاکەی پورە مەحبوبی دەپشکنی. لوولەی نێرگەلەکەی بە ژێر ملی خۆیدا هێنا کە یانی ئەگەر قسە بکەم پورە مەحبوب سەرم دەبڕێت.

بە چاوی خۆم دیتبووم کە پورە مەحبوب لێی دەدا. لە تووڕەیی دا سەری خۆی بە دیوارەکەدا دەکێشاو ئەوسا هێرشی دەکرد. پرزەکانی فانیلە سپی‌و کۆنەکەی هاپۆ قەدیر وەکو پەڕی کۆترێکی مردارەوە بوو بەدەم بایەکەوە سەمای دەکرد.

جنێوەکانی دایکە بە بەشەران تەواو بوو بوون‌و ئێستا چوو بووە کۆڵکی دەرو دیواران، جنێوی بە ئەرزو ئاسمان دەدا. کۆنە چەرچەفێکی

تێوە پێچام. چووە دەرەوەو من بە دنیایەك ترسەوە لە دنیا، بەسەر ناخی خۆمدا كڕ كەوتبوومو لە خۆما هەڵكوڕمام.



## 20

هەینی یانی دەنگو بانگی خوێفرۆشو میوەفرۆشو دەنگی بڵندگۆی ئەو پیكابەی كە شوتی پێیە بە شەرتی چەقۆ. هەینی یانی دەنگی بەرزی تەلەفزیۆنو باوێشكە دوورو درێژەكانی ئەمیر. هەینی یانی گۆڕینی واشەری كۆنی شێرەو چاككردنەوەی سیفۆنی تەوالێت. هەینی یان عەسرانی دوورو درێژو بیانوو گرتن.

میچی ژوورەكە وەكو سوزگییەكە كە دەنگی مۆسیقا لە گەچو خشتو شێلمانەكانیەوە دەڕژێتە خوارێ. كیژەكەی ئاغای هاشمی خەریكی سەما كردنە. بە دەنگی توندی پێیەكانیدا دیارە. ئەمیر بە جۆرێ دەڕوانێتە میچەكە وەك ئەوەی قەرار بێ ئوركستەرێكی تەواو لەو سەرەوە ببینێ.

شادی دەڵێت: "دایكە منت خۆش دەوێ یان سەوزە؟"

شاهین دەڵێت: "ئەمڕۆ تەسجیلیان كڕیوە. مۆدیلێكی زۆر تازەیە."

دەڵێم: "تۆ".

"هاشمی، داماوە، ئەسپێ لە باخەڵیا سەوزەڵێ خانم دەڵێ، ئێستا هیچ ناكا دەچێ تەسجیلی دوا مۆدیل دەكرێت".

ئەمیر بە شتێکی تازەوە گرتوویەتی، بە ناکۆکییەکانی ژیانی خەڵکییەوە گرتوویەتی.

"کرێچینو بە تاکسی تەلەفۆنی هاتوچۆ دەکەن، هەمیشەی خوا لەسەر پارە شەڕیانەو بۆنی عەتری گرانبەهایان هەموو قاڵدرمەکانی پڕ کردووە."

"دایکە من یان مێرووله؟"

دەنگی تەسجیلەکە بەرزتر دەبێت. ئێستا دەنگەکە تەنیا لە میچەکەوە نایەت. لە دیوارەکانیشەوە دەنگی مۆسیقای توندی فەڕەنگی دێت.

"تۆ".

"روحیشمان بەبەردا بکەن هەر دێهاتینو بە هەمان کەلتوورو شارستانیەتی دێهاتیەوە. تەنانەت ئەگەر هەر هەموومان بپەستنە ناو چوار دیوارێکەوە، تەنیا بە جەستە لە ژوورەوەین، جنێوەکانمان لە پەنجەرەوە بڵاودەکەینەوە. لە پەنجەرەو کونو کەلەبەرەکانەوە دەنگی قەرقەشەو شەڕی یەکتر دەژنەوێن".

"باوکە، منت خۆش دەوێ یان بەرد؟"

"بەرد. ئەرێ،گریانی یەکتر دەژنەوین، تەنانەت ئارەزووە ناچیزەکانیشمان لە درزی دیوارەوە دزە دەکەن."

"باوکە، منت خۆش گەرەکە یان قەند؟"

"قەند. دەزانین تەلەفۆنی کێ زەنگ لێدەدا. دەزانین کێ تا نیوەڕۆ دەخەوێو کێ تا حەوت نیوەشەو بێدارە".

"باوکە، من یان خاڵ؟"



"خاڵو وشەو دێڕو ڕستە."

شاهین بە بێدەنگی دەچێتە دەرێ.

"منت خۆش دەوێ یان ئایدا؟"

"ئایدا. پیلەکەت سکوتی نەکرد؟"

"منت خۆش دەوێ یان دایکی ئایدا؟"

"مەعلومە دایکی ئایدا".

دایکی ئایدا لە پشت دەرگایە. ئەمیر بە ئەسپایی دەڵێت:

"حەڵاڵزادە، بەسەر باسی خۆیدا هات".

"قوربانی دەستت یەك دوو سەلك پیازتان هەیە؟"

چەند پیازێکی دەدەمێو دەرکە دادەخەم.

"دەفەرموو، ئەو هەموو زێڕەی لەملە. خۆی لە تەل داوەو هەموو ڕۆژێ قوربانی دەستت چەند پیازو پەتاتەیەکو کاسەیە رۆن".

شادی دەچێتە ناو حەوشە. ئیبی هاتووەتە پشت دەرگای گەراجەکە. منداڵان لە حەوشەدا کۆبوونەتەوەو پارەکانیان بۆ درێژ دەکەن. ئیبی دراوەکان وەردەگرێتو بە نۆرە گۆرانیان بۆ دەڵێت، دەنگی بۆقی ئاگر کوژێنەوەیەك، گۆرانیەکی گوگوش، دەنگی ئاژیری ئوتۆمبیلی پۆلیس. قژی ئیدی درێژە، چاکەتێکی کۆنو دەڵیی لەبەردایەو هەموو گۆرانیەکانی کورتن.

"بە ئەندازەی پارەکەتان."

منداڵەکان چەپڵەی بۆ لێدەدەنو پێدەکەنن. پارچە ئەسکەناسێك دەکەوێتە حەوشەوەو دەنگی ژنێك لە قاتی سەرەوە دێ: "رەقسێکی بەندەری".

**ئەمیر دەڵێت: "فەرقی تۆ لەگەڵ ئەوانی دیدا، ئەوەیە ئەوان پارە دەدەنو لەزەت دەبینن‌و تۆ بەبێ پارە ئەمە دەکەی. تێر نەبوویت؟"**

**لە پشت پەنجەرەکە لا دەکەوم. بۆ کوێ بڕۆم، بۆ کوێ نەڕۆم؟ شوێن بۆ سەرگەردانیش نیە. ئەگەر لە پشت پەنجەرەکەوە نەوەستیت، تەنیا دوو جێی تر هەیە، هۆڵەکەو موبەقەکە، حەوشەکەی پشتەوە لە خوارەوەیەو دیوارە بەرزەکەی لەوسەری دنیایە.**

**دەڵێم: "تێر بووم. دەی ئێستا فەرموو."**

**زۆر درەنگ ئەو قسەیەم گوت.**

**ئەمیر دەڵێت: "لەچی؟"**

**"لە هەموو شتێك، لەم ژیانە"**

**ئێستا کە رووم بە خۆم داوە تازە تێدەگەم، دەزانم کە چقاس دڵم تەنگە. بێزاری وەکو میزڵدانێك لە دڵما ئاوساوە. روندك لە چاوانم دێنە خوارێ.**

**"لەم خانووە، لەم هەینیانە".**

**"من دەڵێم پێویستە لێرە بار بکەین، بڕۆین".**

**دەمەوێ بڵێم "لە تۆش".**

**ناڵێم. وتنی ئەم وشەیە هەموو شتێك دەشێوێنێ، لە ئەنجامی نەوتنیا، لە هەموو لایەکەوە خۆی دەکێشێت بە دیوارەکانی سەرمدا "تۆ، تۆ، تۆ".**

**"تازە خەریکە دێیتە سەر قسەکەی من."**

**نازانم هاتوومەتە سەر کام قسەی. لێ ئەوەندە لەو تێر بووم هەست بە گوناه دەکەم. نەحلەت لە بابی ئەو هەستە کە بۆ هەر جێیەك دەڕۆم**



**دەگەڵم دا دێت‌و لە خوشك نزیکترە لێم. شەهلاو مهین هەندێجار دیار نین لێ ئەم هەستە هیچ کاتێ لێم دوور نەکەوتووتەوە. لە ئەمیر نزیك دەبمەوەو سەرم دەخەمە سەر سینگی. زۆر ڕەقە. سەرم تۆزێ دێنمە خوارتر. ئەمیر قژەکەم نەوازشت دەکات، وا هەست دەکەم من هەمیشە خەڵکی بە هەڵەدا دەبەم، ئەمیر بە خەیاڵیش هەست ناکات، کە ئەوەندە لەو تێر بم.**

## 21

ئەمیر کاتێ تێر دەبێت، وەکو دێوێکی زەبەلاح بە هەنگاوی قورسەوە بە نێو ژوورەکەدا دێتو دەچێت، دەرگاکان بە تەقو هۆڕ دەکاتەوەو دادەخاتەوە. لە حەمامدا هەڵدەکاتە گۆرانیو هەندێجاریش لە پڕێکا، بێ ئەوەی چاوەڕوان بیت، بە دەنگی بەرز هەندێ شیعری حافیز دەخوێنێتەوە.

بەیانیان، کاتی ڕۆییشتن بۆ سەر کار، باشترین کراسی لەبەر دەکات. قژی تەواو ڕێك دەخاتو هەندێك لە پاشماوەی بۆیەی قژەکەی منیش، لە سەری دەداتو سپیەتی قژەکەی خۆی پێ دەشارێتەوە.

لەبەر ئاوێنەدا بزە بە رووی خۆیدا دەدا.

کاتێ لە من تێر دەبێت سکم دەهۆڵێو لاقەکانم وشتری وەبیر دێنێتەوە. هەندێجار لە بەر چاوی دەبم بە نەهەنگو لە دوا ئەنجامدا دەبمەوە بە ورچە قوتبیەکەی لەمەڕ خۆی.

کاتێ کە لە من تێر دەبێت، دەبێ بە پیاوێکی سەڵت کە بە هەڵە لە ماڵێکی قەرەباڵغدا میوانە. لەم کاتانەدا منداڵەکان گێژو حۆلن، کونجکاوو لاپرەسەن نینو لە باوکیان ناچن. موزعیجو دەستو پێگیرن. بە



پرسیاری بێ مانا مێشکت کاس دەکەنو بێ هیچ شەرتو مەرجێك هی منن.

ئەمیر بەخۆی ڕادەگات، و بەڵێنی بە خۆ ڕاگەییشتنی پتریش دەدات.

"وەکو حەماڵ کار دەکەمو وەکو گەدا دەسووڕێمەوە".

هەموو بەیانیەك ڕدێنی دەتاشێت، و بە جۆرێ لە دەرکە وەدەردەکەوێ لە تۆ وایە نەك لە دەرکەی ماڵ، بەڵکو لە دەرکەی ئوتێلێکی نمرە سێ وەدەردەکەوێ. بۆنی قۆڵەنیاکەی سەعاتە ڕێیەك دەڕواتو بە سەعاتان لە ژوورەکە دەرناچێت.

بابە گیان کاتێ لە دایکە تێر دەبوو ڤیتامینی دێنایە ماڵەوە. ڤیتامین ناوێك بوو کە باوکە گیان لێی نابوو. ڤیتامین گۆرانی دەگوتو بە پێچەوانەی قاقاو پێکەنینە بەرزەکەی، چەقەنەی بچووکی لێدەدا. قژی رەشو درێژ بوو. مهین دەیگوت: "ئەگەر ئەم هەموو زیپکەیەی پێوە نەبووایە ژنێکی جوان بوو". بەڵام باوکە دەیتوانی زیپەکەکان بە خاڵ دابنێو شیعر بۆ ڤیتامین بڵێو دایکە پەنا بەرێتە بەر ژێر زەمینەکە، چونکە دەموچاوێکی سافی بلورینی هەبوو و چ کەسێك نەبوو شیعری بۆ بڵێ.

پورە مەحبوب دەیگوت "ئەگەر ژن بیەوێ لە کونی مشکیش دا بێ شیعر بۆ خۆی پەیدا دەکات".

قاقا پێدەکەنی "مشکان ناچار دەکات گۆرانی بۆ بڵێن".

پورە مەحبوب لە شیعری کەم نەبوو. بۆیە دەیتوانی ڕۆژی سەد کەڕەت تەمەشای خۆی بکات، یەك جۆرە تەمەشا نا، سەد جۆر، نیگاو تەماشای دراوسێیەك کە بەزوویی دێتە ژوورێ، تەمەشای بێگانەیەك کە

به چەند شەقاوی ئەودا رەت دەبێتو چاوی بەو دەکەوێو هەندێجار ئەوەندە بە وردی تەمەشای خۆی دەکرد کە تەنیا لەپزیشکێکی وردو دڵسۆز دەهات. بەوپەڕی ناسکیو وردی ئاماسی ژێر چاوەکانی دەنیشاندەوەو بە هەمان دەستی نەوازشتکار پێستی ملو گەردنی ساف دەکرد.

دایکە کە تێر دەبوو، هەرچی شتو مەکی ناو ماڵەکە هەبوو لە حەوشەدا هەڵیدەڕشتو چەند رۆژ بە دەم خوتەو بۆڵەوە هەموو شوێنێکی خاوێن دەکردەوە. دەرو دیوارو زەویو هەموو شوێنێکی خاوێن دەکردەوەو دەسڕی، کونو کەلەبەری ژوورەکانو ژێر زەمینەکەی خاوێن دەکردەوەو هەر شتەی چەند جارێك دەشت. لە کاتی ماڵ پاك کردنەوەو تەکاندنی جێگەو باناندا تەنیا رێگەی شەهلای دەدا بچێتە ژێر زەمینەکە. دەیگوت:

"هەموو شوێنێك گلاوە. خەریکە مردار پاك دەکەمەوە".

به بیانووی خاوێن کردنەوەی ماڵەوە، هاپۆ قەدیری لە کۆڵ کردەوە. و ئیدی رێی نەدا بێتە ژێر زەمینەکە. بەجۆرە دایکە ماڵەکەی هێدی هێدی لە سێبەرو تارماییان پاك کردەوە. لە روحو تاپۆیانی خاوێن کردەوە. هەروەها لە شەریكو میوانو ڤیتامینو هەموو غەریبەو بێگانەکانیش. پاش تەواوکردنی کارەکەی ئیدی هەموو شوێنێك پاكو خاوێنو کڕو کپ بوو و باوکە گیان میناکی مردوویەکی چاوەڕوانی شتن، بە تاقی تەنێ لەسەر تەختی ژێر زەمینەکە ڕاکشا بوو.

شەهلا کە بێتاقەت دەبێ، تێر دەبێ، رژیم دەکات. تەنیا کاکڵە فندقو بادەمو پستە دەخوات.



دایکە دەیگوت: "حەیف نیە ئینسان ئەم هەموو دەرامەتەی هەبێ و بە دوو دانە فندق هەڵ بکات".

مهین کە تێر دەبێ ، دەبێ بە ژنی پیاوێك کە نایناسێتو بۆ ئەو سەری دنیا دەڕوات.

من دەبێ لە هەمووان هەژارانەترو نابووت تر بم کە تێر دەبم دەبێ سەر بنەمە سەر سکی کەسێك کە لە هەموو کەس زیاتر لێی تێرمو دەبێ گوێ لە قۆڕە قۆڕی ڕێخۆڵەکانی بگرمو ئەوجا شەرمەزاری ئەو هەموو تێرییە ببم.

## 22

تەنیا مردن دەتوانێ ژیان بگێڕێتەوە دۆخی یەکەمجاری. ئەگەر لە پڕێکا دڵم بوەستێو درێژاو درێژ لە ناوەندی موبەقەکەدا بکەوم، ئەمیر هەنگێ دەتوانێ من بدینێ. نامەوێ تامپۆن بکەمو سەروسیمام بشێوێ. نامەوێ سەرەتانو شێرپەنجە بگرمو زەردو لاواز ببم. سەکتە لە هەموو مردنێك پاكو پوختەترە. تەختی زەوی دەبم. لەگینە بەو کەوچکەوە کە قەرارە شیرەکەی پێ بشێوێنم. رووم لە بن میچەکەیە، چاوانم کەوتوونە مۆڵەق. هێشتا نەمردووم، بەڵام ئەمیر ئەمە دەبینێ.

باوکە گیانیش کە مرد، ئێمە نەمانزانی. وامان دەزانی زندووە، بەڵام ئەو لە ژێر زەمینەکەدا مردبوو، بە تاقی تەنیا. باوکە گیان شەیدای ژن و پستە و گۆرانی بوو. بەڵام ئەمانەی نەدەویست.

"کوڕەکەم، قاژێك لەو شتە سوورو ئاودارەم بدەیە".

دایکە ئاهی هەڵدەکێشا. باوکە گیان دووبارەی کردەوە:

"کوڕم ئەو شتە سوورو ئاودارەکەت هێنا؟ تینوومە. زۆرم تینووە".

خۆی دەکوشت و دەبڕی ناوی شووتی وەبیر نەدەهاتەوە.

مهین ویستی بچێتە دەرێ.

شەهلا گوتی: "بەم سەرماو بەم شەوە؟"



مهین گوێی نەدایێ. هەمیشە لە دووی مەحاڵانە.

دایکە لە ناو دەرگای ژێر زەمینەکە وەستا.

"هەموو ئەم ناوە بۆگەن دەکات".

بەبێ خواردنی شووتیش بۆگەنی دەکرد.

"ئەو ناوەی نەهێشتووە، پاکی بکەنەوە". فریا نەکەوتبوو خۆی بگەیەنێتە تەوالێتەکە، بەخۆیدا میزتبوو.

لاقەکانی بە عاریدا بکێش دەکردو نەیدەتوانی بە قالدرمەکانا سەر بکەوێ.

دایکە دەستی لە مردنی باوکە گیان شۆردبوو، باوکە گیان ئیدی دەبوو بزانێ کە ئەم کزەکزەو خۆ گەیاندنە حاڵی مەرگە هیچ ناگۆڕێ، ئەو دەبوایە بە ڕاستی بمرێت.

ئا ئێستا پێویستە ئەمیر نیگام بکات، بە هەمان وردی کە ساڵانێك لەوە پێش نیگای دەکردم. بە هەمان میهرو خۆشەویستییەوە کە لە قولایی چاوەکانیا بوو. دەتوانێ وردە چرچی دەوری چاوی ژنێك کە دوای ساتێکی دی بۆ هەمیشە لە دەست دەچێت ببینێو کەمێك هاوخەمی دەگەڵدا بنوێنێ. دەتوانێ برۆکانم بدینێ، کە چەند مانگە هەموو خەڵكو خوا دەزانن و تەنیا ئەو نازانێ کە ئیدی برۆ کەوانییەکانی جاران نین. بێگومان دەستم دەگرێتو ئەگەر بە دەمیش ستایشی نەکات لە ناخی دڵیا هەست دەکات ئەمە هەمان دەستە کە ئەوی دێنایە جۆشو خرۆش.

"هێی، حەواست لە کوێیە؟ شیرەکە هەڵچوو".

بە نائومێدی زیندوو دەبمەوە، زۆرم بە زەیی بە خۆدا دێتەوە، بەو حاڵەوە دەکەومە شێواندنی شیرەکە، کەوچك بەدەست ئاوڕی لێدەدەمەوەو

به پەستییەوە سەیری دەکەم. دانەویوەتەوەو پەنجە تووتەی پێی معایەنە دەکات کە هێندە وشکە لە پارچە ئێسقانێك دەچێت. بیر دەکەمەوە بۆچی ئەو پیاوەی کە دەتوانێ بە هێی بنیادەم گاز بکات، نەمرێت؟ بێگومان مەرگ خۆشەویستتری دەکات، وەکو چۆن باوکە گیانی خۆشەویست تر کرد. مهین بە جۆرێ باوکە گیانی بۆ مێردی ئایندەی وەسفکرد کە لە تۆ وایە باسی کەسایەتی جانڤالجان-ی دەکرد، سەررێژو لێوان لێو لە ئابڕومەندیو دروستکاری، دایکەش خێری بۆ کرد.

به دیاریەوە شیوەن دەکەم. سینگی بۆ دەکوتم. سەرپۆشەکەم دەدڕمو پارچە پارچەی دەکەم "ئەمیر بگەڕێوە لە دەورت گەڕێم ئەمیر بگەڕێوە".

ژنان شانیان گرتووم تا قەنداغم بەدەمەوە بکەن، بەلاّم من هەر حوربی لێدەدەم، فزاح دەکەم "ئەمیر بگەڕێوە. چی لە منداڵەکان بکەم ئەمیر؟"

ئەو ژنانەی کە توند دەستیام گرتووم نازانن کە دەمەوێ ئەمیری دە ساڵ لەوە پێش بگەڕێتەوە. ئەو ئەمیرەی کە کاتێ بنیادەم دەیڕوانیە دورچاوانی لە دڵی خۆیدا دەیگوت "خودایە چەند جوانە."

ئەمیر دەڵێت "بۆچی وەکو شێتان لێم دەنۆڕی؟"



# 23

لە پەنجەرەکەوە تەمەشای دەرێ دەکەم. بە ئەمیر دەڵێم "خێرا وەرە".

ئەمیر بەبێ مەیلی دێتە بەر پەنجەرەکە، بە دوو قۆڵی دەکەوینە تەمەشای ئەو پیاوە تەنیایەی کە عەسران دەف لێدەداتو هەنووکە لە قفڵی دەرگاکە وڕوکاوە.

ئەمیر دەڵێت: "باوەڕم نەدەکرد ئەوەندە لاواز بێت. پێدەچێ توەڕو تڕۆش بێت".

دەڵێم: "بەڕای من توڕە نیە هەستیارە".و دەخوازم بڵێم دەستەکانی بەهێزن، بەلاّم زوو قسەکەم دەگێرمەوە. دیتنی دوو ئیجابیەت بە یەك نیگا هەندێ موبالەغە ئامێزە، و هەر جۆرە موبالەغەیەك لەلایەن منەوە، ئەمیر پەست دەکات، خۆم بە موبەقەکەدا دەکەم.

ئەمیر تەمەشاکردن بە کارێکی کرێتو ناشیرین دەزانێ. دەگەڵ کەسایەتی ئەودا ناگونجێت. بەلاّم من ئاشقی ئەم کارەم. بۆ ئەم کارە پەنجەرەکەو کونی سەر دەرگاکە زۆر بەکارم دێن. بەلاّم ئێستا ئەمیر بە پەرنجەرەکەی گرتووەو لە جێی خۆی ناجولێتو بە دەست پەردەکەی داوەتە دواوە.

به هەشتاو خۆم دەگەیەنمە سەنگەرە هەمیشەییەکەم، لایەکەی دیکەی پەردەکە. جوجەخۆر دەستی کردووە بە چەتر بۆ چاوی‌و دەڕوانێتە ئەوسەری کۆڵانەکە.

ژنێکی تەڕپۆش‌و خشکۆکەو خوێندنەوەو زانینی ئەو شتەی بە مێشکی ئەمیردا تێ دەپەڕێ زۆر قورس نیە. بەڵام ئەو هەمیشە من لە توانا هرزخوانیەکانم دەخاتە گومانەوە.

لە کاتێکا کە هێشتا لەبەر پەنجەرەکەدا و لە پشت پەردەکەوە وەستاوە دەڵێت: "نەگبەت".

"کێ نەگبەتە؟ جوجە یان جوجەخۆر؟"

وەڵامەکەیم بەلاوە گرینگ نیە.

"نەگبەت منم کە خەریکم لەم کونەوە دەڕوانمە دنیا".



## 24

ئەمیر لە خەو ڕادەبێت‌و داوای ئەو کاسێتە دەکات کە لە باکۆ هێنا بووی.

دەڵێم: "دوایی بۆتی دەدۆزمەوە".

"نا، ئێستا".

"جارێ دانیشە، تێشتەکەت بخۆ".

ئەمیر تێشتی نەگەرەکە. کاسێتەکەی دەوێ.

دەپرسم "چیە خەوت دیتووە؟"

وەڵام ناداتەوەو میناکی کەسێك کە وەختێکی کەمی بۆ گەڕان بە دەستەوە بێ چەکمەجەکان ڕادەکێشێ‌و دادەخاتەوە. کاسێتەکە دەدۆزمەوە "بفەرموو!"

پێموایە پێویستە بەلای کەمەوە نیگایەکی منەتبارانەم بکات، بەڵام دەڵێی من هەر وجودم نیە. کاسێتەکە دەخاتە سەر تەسجیلەکەو هەڵی دەکات. دەنگی کەمانچەیە، لە تەنیشتییەوە دادەنیشم. ناکرێ لێی بپرسیت کە چ شتێکی بیر کەوتووەتەوە. مەحاڵە سەر لەوە دەربکەی کە ئەمیر ئێستا لە کوێیە. بە تەنیایە یان دەگەڵ کەسێکی تردایە. لە هۆڵی کۆنسێرت دایە یان لە شەقامە. بەڵام لە هەر شوێنێکە، منی لێ نیم،

من وجودم نیە. حەز دەکەم قاپەکان بدەم بە سەریەکاو هەرا بنەمەوە. حەز دەکەم کارەبا ببڕێتو دەنگی تەسجیلەکە ببڕێ. نهێنییەك وەکو حەیوانێکی چکۆلە خۆی بە ماڵەکەماندا کردووەو من ناییناسم. نازانم چیە. تەنانەت ناتوانم دەستێکی بەسەرا بێنم.

دەڵێم "درەنگ بووە، ناچی بۆ کار؟"

گوێی لێم نابێ، دەنگی چەهچەهە ماڵەکەی پڕ کردووە. تەنیا دەنگی تەیر نیە، مۆسیقا تاقی ئاسمانی هێناوەتە سەر زەوی

بە دەنگی بەرزتر دەڵێم "دوا کەوتیت".

لە دیار تەسجیلەکە هەڵدەستێ. میناکی منداڵێکی نیمچە برسییە کە بە تۆبزی لەسەر سفرە هەڵیانساندبێ، پێڵاوەکانی لە پێ دەکاتو بە جۆرێ تەمەشام دەکات کە دەڵێی خەتای منە کە لەم ساتە وەختەدا شێوەو روخساری ئەو ژنەم نیە کە رۆمانسیانە خۆشی بوێ.



# 25

دەنووسم مهینی ئازیز، دوێنێ بەیانی، شادی نامەکەتی لە دەست یارۆی پۆستەچی وەرگرتو بە هەڵەداوان بۆ ماڵەوەی هێنا. بەڵام لەسەر هەڵپچڕینی زەرفەکەی دەگەڵ شاهین دا لێیان بوو بە شەڕ. گوتم هەر کەسێك زەرفەکە هەڵپچڕێ پولەکە هی ئەوە، شاهین یەکسەر پاشەکشەی کرد. شادی زەرفەکەی هەڵپچڕی، ئەمیر گوتی "بێنە با من بیخوێنمەوە".

حەزم نەدەکرد ئەو نامەکە بخوێنێتەوە، جا چ خوێندنەوەیەك، بە دەنگی بەرزو پڕ غەڵەتو پەڵەت. خۆ رۆژنامە نیە. نامەیەو هی یەك کەسە. وێڕای ئەمەش هیچ قسەیەکم نەکرد. بەڵام هەموو لەزەتەکەی لە بەین چوو.

مهین گیان دەبێ ئەوە بڵێم، نامەکانی تۆ هەمیشە وردە شەڕو ئاژاوە لە ماڵەکەماندا دەنێتەوە. دوای خوێندنەوەی نامەکە ئەمیر دەڵێت "چ رۆژگارێکی رەش ڕادەبوێرین". ئەم قسەیە هی عەسرە، کاتێ کە دوای رۆژێك زێدەکاری دێتەوە ماڵێو لەبەر کولەرەکەدا خاو دەبێتەوەو ئاخ هەڵدەکێشێت، نەك هی بەیانی کە کاتی کارەو هێشتا کات هەیە کە دنیا بگۆڕێت.

کیژێ، لە نامەکەتدا باسی ئەمریکایەك دەکەیت، کە هەموو کەس لەوێندەر بە شادی دەژی. هەموو کەسێك چۆنی دەوێ وا بیر دەکاتەوە، قسە دەکاتو دەژی. باسی ئەو ژنە پیرانە دەکەی کە هەست دەکەن گەنجو بە شنگو تاقەتن، و باسی گەنجەکانیان دەکەی کە خودانی جوانترین پێکەنینو خەندەی دنیان، شەهلا دەڵێت: مهین بۆ هۆڵیوود رۆییوە، نەك بۆ ئەمریکا. کێشەی من ئەمەیە کە ناتوانم ئەو جۆرە دنیایە لە زەینی خۆمشدا وێنا بکەم چ جای ئەوە کە باوەڕی پێبکەم، دنیایەکی یەك دەست، بێ ناکۆکیو بێ هیچ رەنجو داخو حەسرەتێك. بەڵام ئەمیر باوەڕ دەکات. چونکە هەندەران، بە تایبەتی کەنەدا، تاقە خۆرافاتو ئەفسانەی ژیانی ئەوە. ئەو ئەمیرەی کە تەنانەت ئەگەر شتێك بە چاوی خۆیشی بدینێ بە ئاسانی باوەڕی پێناکات کەچی ئێستا لەو رووەوە باوەڕ بە هەر ڕاستو درۆیەك دەکات.

لەوەشە ئەشق لە خودی بەشەردا بێت، وا هزر دەکەم دەشێت بە ئەشقەوە وەکو پەساپۆرت بۆ هەموو شوێنێ بڕۆیتو لە هەر شوێنێ بتەوێ بژی. ڕاستت دەوێ من ئەم پەساپۆرتەم لە بەڕکدا نیە. دەترسم بێم بۆ ئەو ناوانەو بە گیرفانی بە تاڵەوە ون ببم. ئەوسا دەبێ دەستەودامێنی یەکێك ببم. دەترسم بۆ بەهەشتەکەی تۆ بێمو چاوم بە پاشماوەکانی ئەو دۆزەخە بکەوێتەوە کە بە لەشمەوە لکاون. هەق بە تۆیە من زاتو جورئەتی سەفەرم نیە. هەر بۆ ئاگاداری حەزدەکەم ئەوەت پێ بێژم کە ئەمیریش هەمان قسە دەکات. کە گەییە ئێرەی نامەکەش سڵاوو درودی بۆ ناردیت.



تا لە بیرم نەچووە با پێت بڵێم کە شەهلا داوای کردووە بۆی بنووسیت ئایا شرینقە بۆ لابردنی چرچو لۆچی دەوری چاو باشە یان نا؟ ئەمیر دەڵێت شەهلا میناکی زۆربەی ژنان کێشەکانی لە کۆتاییەوە چارەسەر دەکات، بە نۆڕینی ئەمیر کێشەی یەکەمی شەهلا شوو نە کردنەکەیەتیو چرچو لۆچەکانی دەموچاوی کێشەی دواییەتی.

هاونشینی شەهلاو دایکە لە یەك ماڵدا، وەکو ئەوسا ئەو جووتەی میناکی خوشکی جمکانە لێنەکرد، کە خۆ بە ژێر زەمینەکەدا بکەن. بە سەعاتان پێکڤە فسکە فسك بکەن، لە هاتو هاواری باوکە نەترسنو لە دەرکردنی بێگانان لە ماڵەکە هاودەستو هاوکاری یەکتر بن. ماوەیەکە شەهلا لە دنیا تۆراوە، دایکە دەڵێت: "هێشتا زووە، شەهلا گەنجێکی ساغو سەلامەتەو زۆری ماوە بۆ لە زکەوەچوون".

دەڵێم "شەهلا تەمبەڵ بووە".

دایکە ئاهێك هەڵدەکێشێت.

"زیرەكو زیتەڵی هەمووتان مهین بوو بۆ خۆی لێیداو رۆیی".

بەڵام ئەی کیژە زرنگو زیتەڵەکەی دایکە، کاتێ باسی جوانترین خەندەو پێکەنینی دنیا دەکەی، ڕاستت دەوێ بەغیلیم نایەت، بەڵام حەز دەکەم کەمێك داخی دڵم هەڵڕێژم. گرێی دڵم بکەمەوە. تۆ ئەو رۆژانەت وەبیر نایەتەوە. هەمیشە بە جۆرێ دەژیایو زندەگیت دەکرد وەك ئەوەی ژیان ئائێستا دەستی پێکردبێ. هەروەها شەهلاش، ئامان لە دەست ئەم شەهلایە، هێشتا کەس گوێی لێ نەبووە بیرەوەرییەك بگێڕێتەوە، ئافرەتێکی بێ بیرەوەرییە، هەمیشە ئامادەیە زاراوە جوانەکانی دەروونناسی دەرخواردی بەرانبەرەکەی بدات.

"دەبێ لەو ساتەدا بژیت کە تێیدایت".

وەنەبێ ئەم ساتەشی زۆر خۆش بێ! هەمیشە لە دەستی هاوکارانی دایەرەی‌و لە چوونە سەر تەوالێتی دایکە بە گلەیی‌و گازاندەیە. لێ من زۆر چاك لە یادمە کە هەمیشە لایەکی دەموچاوم دەئاوسا. هەمیشە دانێکم دەیەشا، کیسی دەکردو زاری بۆگەن دەکردم. کاتێ بۆ لای دانسازیان دەبردم، کە دانەکەم تەنیا بە کەڵکی هەڵکێشان دەهات. ئەوەندەم بیرەوەری دەگەڵ دان یەشەو گازی دەستی دکتۆری داندا هەیە، کە هەندێجار وا دەزانم دوو ئەوەندەی خەڵکی تر ددانم هەبووە. هەڵبەتە ئێستا نیوەی خەڵکیشم نیە. ڤیروسیا لە نەجوونی باشی خواردن‌و گەدە ئاوسان، ئەدی چی لە پێکەنین بکەم؟ وا هەست دەکەم نەك هەر ددانەکانم، بەڵکو پێکەنینەکەشیان خراپ کردووم. بۆیە لە کاتی گریاندا موعەزەب نیم، بەڵام لە کاتی پێکەنین دا مەحاڵە کەسێك کە لە بەرانبەرت دانیشتبێ ئەوەندەی بایەخ بە قسەکانت دەدا کەمتر لەوە سەرنجی ددانەکانت بدات.

باوکە گیان هەر کە منی دەبینی دەیگوت "کوا ددانەکانم وێدە".
کاری لەوە ناخۆشترو قورستر نەبوو، دەرهێنانی دانە عەمەلیەکانی باوکە گیان لە نێو پەرداخەکەو پاشان کە ترق لە دەمی دەکردو دەیخستەوە شوێنی خۆی.

دەیگوت "دان شتێکی باشە".

بە سەرسامی سەیرم دەکرد. نەمدەزانی مەبەستی لە ددان ددانی ڕاستیە یان شتێکی دیکەیە. تەنانەت بۆم جیا نەدەکرایەوە کە پێدەکەنی یان دانەکانی بە باشی جێی خۆیان نەگرتووەتەوە. دانە عەمەلیە هێشتا



ئاودارەکانی دەبریقانەوە. دانم وەکو زۆربەی کات دەی زریکان‌و هیچ ئومێدێك بە ئایندەی دانەکانم نەدەکرا. زۆرم حەز دەکرد داد بەرمە بەر کەسێك، بەڵام دایکم خەریك بوو بە دەم بۆڵە بۆڵ‌و خوتەوە جلی دەشۆرد.و باوکە گیان هیچی لە قسەکانم هەڵنەدەکڕان، تێیم نەدەگەیی. دادگاییکردنی بە شەرێکی بێ دەسەڵات هیچ ڕەونەق‌و لوتفێکی نیە. مەیلی هەقخوازی بە یەکجاری لای بەشەر کوێر دەکاتەوە.

هەمان سات بوو کە باوکە گیان قسەیەکی دەکرد، کە نەدەبووا بیکات.

"پستەت هەیە؟"

دایکە میناکی مار دەی فیشکاندو لەسەر تەشتە جلەکە هەڵدەستا.

"ئەم پیاوە دڵیشی بوەستێ گەدەی هەر کار دەکات".

نیگایەکی باوکم دەکرد. نازانم پێدەکەنی یان ددانە عەمەلییەکانی دەنواند.

ئەمیر خەریك بوو بە تۆنێکی پڕ جۆش‌و خرۆشەوە نامەکەی دەخوێندەوەو منیش پێ دەکەنیم. دڵنیام کە ژنانی خۆشخەنی فەڕەنگی ئەوێ ناتوانن بەجۆرە پێبکەنن. چونکە ئەسڵەن جوان نییەو پێکەنینێکە کە لە جیاتی ریزێ ددانی سپی‌و بریقەدار، چەند روکەشێکی مات‌و تەڵخ دەنوێنێ.

ئەمیر خوێندنەوەکەی نەبڕی. تەنیا دەنگی وەکو چۆن کەسێك لە کاتی نوێژکردندا میوانێکی بێت، بەرزتر کردەوە.

شاهین‌و شادی چاویان بڕی بووە دەمی ئەوو دەمی خۆیان کرابووەوە.

ئەمیر بە پەلە گوتی "خێرا بۆی بنووسە. پێویستم بە زانیاری تازە هەیە. بنووسە مهین بۆمان بنێرە".

گوتم "خۆت بۆی بنووسە".

گوتی "تۆ باشتر دەنووسیت".

رووم گرژ کرد.

دەستی دا بە شانما "دەی بنووسە حەیاتم. لەبەر ئایندەی خۆمان".



# 26

ئاینده چیه؟ ئاینده دەبێ وەکو هەمان ئەو پیرەژنە بێت کە وەکو کارتۆنێکی زەرد هەڵگەڕاوی چرچو لۆچ بوو، و ئەمیر لە پارکەکەدا نیشانی دام. ناتوانم بیر لە ئاینده بکەمەوە. نازانم لە چی دروست دەکرێ. تا گەییمە ئەم تەمەنە، دەمتوانی بیر لە ئاینده بکەمەوە. لێ ئێستا دەبینم بە ئەندازەی پێویست، لەو شتە ئاڵۆزەی کە رۆژ بە رۆژ زیاتر ئەفسوونو ڕازی خۆی لە دەست دەداتا، نزیك بوومەتەوەو ئیدی دەخوازم لێرەدا بوەستم.

دەمەوێ بوەستمو تەمەشای خۆمو ژیانم بکەم. لە دوورەوە وەکو غەریبەو نامۆیەك‌و لە نزیکەوە وەکو ئاشقێك. نامەوێ بۆ کەنەدا بڕۆم. نامەوێ نیوەکەی تری ژیانم بۆ ئەوە تەرخان بکەم کە دەگەڵ ژیانی ئەوێندەردا بگونجێم، چونکە تا شوێنی خۆم دەدۆزمەوەو ڕادێم، ئیدی هەموو شتێك تەواو بووە.

باوکە گیان بەر لە مردنی تۆزێك پارەی بۆ جیازیەکەم خستبووە لاوە. شەهلا بێزاری خۆی لە هەموو پەیوەندییەك بە ڕەگەزی پیاوەوە ڕاگەیاند بوو. مهین دەزگیرانی هەبوو. نەدەکرا لەمە پتر دوا بکەوم. هەموو هەلومەرجێك بۆ زەماوەندو شووکردنی من ئامادە بوو. ئەمیر هاتبووە

خوازگاریمو منیش زۆر زوو چـوومە ریـزی خێڵـی مـەزنی ژنـانی مێـرد دارەوە.

کە شووشت کرد هەموو دنیا بەر لە هەر کارێك سـەعاتێکی گـەورە بە دیواری ژووری نووسـتنەکەتەوە هەڵدەواسـنو بـۆ ژنـەوتنی یەکـەمین هەواڵ دەقیقەژمێری دەکەن. پاشان یەکێك شلەی هـەلۆژەت بـۆ دەخاتـە سەرو یەکێك نانەقەیسیت بۆ دەکرێت. یانی هەر کەسەو شـتێك دەڵێـت. لە پاسدا یەکێك لە بەرت هەڵدەستێتو شوێنەکەی خۆیت دەداتـیو لـە رێگەوباندا هەموو نیگاکان بەسەر سکتدا دێنە خوارێ کە هەنووکە خـڕ بووەو بە خڕییەکەیدا دیارە کە کوڕە.

پاشان رۆژگارت بەمە دەگوزەرێ کە ئاخۆ عەمەلیاتی قەیسەری باشە یان منداڵبوونی ئاساییو سروشتی، و هەر هـەموان گۆڕانکاریـەك لـە سەروچاوتا دەبینن کە تۆ پتر لە ناخو دەرونتدا هەستی پێدەکەیت. جل بۆ منداڵەکەت ئامادە دەکەیتو کاتی بێکاریت دەربـارەی ناوەکـەی دەگـەڵ مێردەکەتدا بەسەر دەبەیت. پاشان رۆژێك ژان دەتگرێـت، وەکـو یـەکێك چاوەڕوانی بوو‌بیت بەڵام لە ناخی خۆتا باوەڕت نەکردبێت. ترس بە سەرەتا هەرەس دێنێ. ترسەکە لە ژانو ئازارەکە پترە. دەچیت بۆ خەستەخانەو بـۆ سبەینێ بوونەوەرێکی نائاشناو زۆر بچووکت، کە چـۆلەکەیەکی لـە ئـاو هەڵکشاوت وەبیر دێنێتەوە، بە سینگەوە دەچەسـپێننو دەیانـەوێ شـیری بدەیتو لەوە دەمە بە دواوە ئیدی دەبیت بە دایك.

لەسەر تەختی خەستەخانەکە بڕیار دەدەی کە ئیدی ئەم یەکە بەسـە. نازانی کە بڕیارو کردەوە وەکو ژنو پیاوێك وەهان، کە بە یـەك دنیـا بـێ مەیلییەوە لـە تەنیـشتی یەکـەوە وەسـتاونو وا دەنـوێنن کـە مـوو بـە



بەینیانەوە ناچێت.. چەند ساڵێك دەبورێ. بیری مەرگی تاقە منداڵەکـەت وەکو قاقەزقوشییەکی (کۆلارە) سەرگەردان بە حەواوەیـەو ئـەو دایکـەی کە رۆژگاری لێ دەبێ بە تەوقو بێـزاری زووتـر لـە هـەر کەسـێکی دی دەیبینێ. هەنگێ گوێ بۆ سەدای ژنێك دەگرێت کە هێـشتا لـە سـكو زا نەکەوتووەو دڵی بەدنیاوەیەو بەردەوام بە گوێیدا دەچپێنێ "باشـە ئەگـەر منداڵەکەت بمرێت چ دەکەی؟" ئەمە جگە لەوەی ئەو منداڵـە دایمـە بـە تەنیایەو دروستکردنی هاو وازییەکی چکۆلە بۆ منداڵەکـەت زەرەرێکـی نابێو لە پاش مردنی دایكو باوکیان دەبنە پشتو پەنا بـۆ یـەکترو خـۆ تازە کاری تۆ بووە بە شۆردنی میزو گوو ئەم کارەت هیچ لەبەر گران نیە ئیدی بۆچی ئەم توانایە نەخەیتە خزمەتی منداڵانی زۆرتـرەوە، و هـەزارو یەك بەڵگەی دی بۆ خۆت دێنیتەوە. ئەوسـا بـە منـداڵی دووەم حامیلـە دەبیتو بەمجۆرە دەبی بە دایکی تەواو عەیار.

کاتێ چاو دەکەیـەوە دەبـینی کـە بـۆ هـەر کـوێ دەڕۆیـت هـەواڵی منداڵەکانت دەپرسنو بۆ هەر کوێیەك دەڕۆیت ناچـاری دەگـەڵ خۆتیـان ببەیو لە هـەموو حاڵێکـدا ژیـان بەسـتراوەتەوە بـە ژیـانی دوو کەسـی دیکەوە، رۆژگارێك دێـت کـە تـەنیا بـە "فێـر بـوونی مـەمك مـژین" نابڕێتەوە، رۆژانێکە کـە هـیچ کەسـێك لـە هـیچ کتێبێکـدا دەربـارەی نەنووسیون.

مهـین دەچـێتە کلاسـی زمـانو نامـەێن عاشـقانە بـۆ دەزگیرانـە نەبینراوەکەی دەنووسێت. شەهلا گیرۆدەی قیستو قەرزی خانووەکەیـەتی کە دوو ژووری نووستنی تێدایەو لە گەڕەکێکی باشدا کڕیویەتیو جا کـە مهین-ش دەڕوات، دەتوانێ دەگەڵ دایکەدا لە یەك ماڵدا بژی.

ئەمیر کۆڵەپشتییەکەی ئامادە دەکات کە پەنا بەرێتە بەر چیا. لە دەستی ئەم ژیانە پڕ نق‌و جقەی منداڵ. دەڵێ ئەم ژیانە تا رادەی مردن بێتاقەتی دەکات. دەتۆرێم، روو گرژ دەکەم. منداڵەکە خەریکە شیر دەخوا.

دەڵێت خۆ بۆ مردن ناڕوات. بە پێنج رۆژێك دەچێتە سەر شاخ‌و دەگەڕێتەوە. گوایە بیر لە ئێمە دەکاتەوە بۆیە دەچێتە ئەم سەفەرە کورتە، دەنا ئێستا لە بناری چیای ئیڤریست دا دەبوو. ئەمیر وەك باڵندەیەکی کۆچەری دەچێت کە ئێستا لە قەفەزیان ناوە. دڵی کەڵکەڵەی فڕینی کردووە.

دەڵێت: "لێ تۆ ورچی قوتبیت. تۆ ئەم ژیانەت پێ خۆشە. ئەم منداڵانە تۆ هێناوتنە دنیا. خۆ خەجە خان نەیهاوردونەتە دنیا".

بەفر دەبارێ. دەبێ شلەمەنی دەرخواردی شادی بدەیت چونکە ڕەوانەو تایەکی کەمیشی هەیە. شاهین لێکدا لێکدا دەکوکێ. ئەم منداڵانە دەبێ گەورەبن. باڵندە کۆچەرییەکە ئەمجارەیان بەرەو دەماوەند لە شەقەی باڵی داوە.

دایکە لای تۆیە.

"ئەوەندە خۆت سەغڵەت مەکە. با هاوسێکانت هاتوچۆت بکەن. بەشەر لێرە دڵی دەگیرێت. هێشتا ماڵەکەی پێشووتان باشتر بوو."

منداڵەکان دەبێ گەورە بن.

"بە دیاریانەوە دۆش دامەمێنە. یەکێ نەزانێ پێی وایە خوا نەکەران نەخۆشن".

ئەم منداڵانە پێویستە گەورە بن.

دەبێ دەرزییەك لە شادی بدەی. شادی بەردەوام دەزریکێنێ.



شاهین دەڵێت: "دایکە، با شادی بەرین لە بازاڕ بیفرۆشین، و لە کۆڵ خۆمانی بکەینەوە."

شادی قامکی دەخوات.

"بیبەر بکە بە قامکیاو ئەم دەرگایە داخە."

شاهین شەوانە لە نێو نوێنەکەی دادەنیشێت‌و بە دەنگی بەرز دەگری.

"ئەگەر گوشارم بەرز بێتەوە چ بکەم؟ نە ترومبێلێ نە تەکسی تەلەفۆنێ"

منداڵەکان دەبێ گەورە بن.

شاهین، شادی خستووەتە گریان‌و سزا دەدرێ.

"لێت دا لێت دا. چ قەیدیە. منداڵ بە لێدان گەورە دەبێ. ئەمە خەفەتی ناوێ".

لە دڵی خۆدا دەڵێم:

با دەیەوێ، منداڵ بە کوتەك‌و لێدان گەورە نابێت، منداڵ بە حەقارەت‌و بێزراندن گەورە نابێت. بالا دەکات بەلام هەرگیز گەورە نابێت.

شاهین دەڵێت: "دایکە، تۆ شادیت لە من خۆشتر گەرەکە."

بەفر دەباری. ورچە قوتبییەکە لە ژێر لێفەکەدا نووستووە، ورچە قوتبییەکە چیرۆك‌و حیکایەت بۆ منداڵەکان دەگێڕێتەوە.

نیسکیان بۆ دەکوڵێنێ‌و عەسران بۆیان دەباتە بەر دەرگا تا لە کۆڵاندا کایە بکەن.

ورچە قوتبییەکە تاقەتی دەچێت، لە چاودێری بەردەوامی منداڵەکان ماندوو دەبێت. لە دیوارەکان کە تۆکیان هەڵداوە. لە بۆیلەرە سەقەتەکە، لەو سیسرکانەی کە بە هیچ ژەهرێك نامرن. لەو رۆژە درێژانەی کە

درەنگ دەبن بە شەو، لەو شەوانەی کە پڕن لە گریان. ورچە قوتیی، بە خۆڕاییی هاوار بەسەر منداڵەکاندا دەکات.

شەهلا دەڵێت "تۆ دایك نیت".

پێیا هەڵدەشاخم "نەخێر نیم. دایك نیم. گام، ورچم".

دایکە دەڵێت: "ئێستا بۆ وا شێت بووی. ئێمە گوناحمان چیە کە مێردەکەت لێیداوەو ڕۆییشتووە."

شەهلا دەڵێت: "وەڵڵا بەم ڕەفتارەتەوە، ئەو داماوە نەهەقی نیە بڕوات."

هاوار دەکەم.

"بەڵێ، من ناتوانم مێردەکەم ڕابگرم."

دایکم هەڵدەستێ، منداڵەکان قۆڵی دەگرن.

"مەڕۆ".

دایکم زویرە "نا، دەڕۆم. یەك تۆزی تر بمێنینەوە دایکت جوابمان دەکات."

شاهین نازانێ جوابکردن مانای چیە؟ بەڵام دەزانێ کە خەتاکە خەتای منە. خەتاکانمان ئێستا یەكو دووان نیە. بەسەر یەکتردا کەڵەکە بوونو وەکو لێفەیەکی تەڕ ئەوەندە قورسە کە دەمەوێ لە ژێریا بمێنم. من نە دایکم، نە ژنمو نە کیژم. هیچ نیم. دەرەقەتی هیچ یەکێك لەو نەخشو ڕۆڵانەی کە پێیان داوم، نایەم. بە منداڵیش هیچ بووم. بوونم هیچ مانایەکی نەبوو. دایکم بە نیازی کوڕ منی هێنا بوو و کچ دەرچوو بووم. بۆ باوکە گیان شاگردێکی چکۆلە بووم لەماڵەوە. منی تەنیا لەو کاتانەدا دەبینی کە پێویستی بەوە بوایە کرێژە سەری سەر چاکەتەکەی



پاك بکەمەوە. باوەشێنی مەقەڵی بۆ بکەم. ڕەژووی بۆ بێنم. نینۆکەکانی بکەم یان گۆرەوییەکانی بۆ دابکەنم، منداڵ بۆ ئەو وەکو نەخشو نیگاری سەر نێرگەلەکەی بوو. هەمیشە نێرگەلەو قلیانی نەخشداری پێ پەسندتر بوو لە هی بێ نەخشو نیگار.

مهین پەنجەرەکان دەکاتەوە. دنیا گەرمو هەتاوە.

"من لەلای ئەم فیسقەگولانەم تۆ بڕۆ بۆ خۆت بگەڕێ، بۆ خۆت هەوایە بگۆڕە، با خەیاڵت ئاسوودە بێت، بچۆ دۆندرمەیەك بخۆ. کارێ بکە با لەم حاڵە دەربچی، ئەوەندەش خۆت ناڕەحەت مەکە. بچۆ لە ئاوێنەدا سەیری خۆت بکە".

حەز ناکەم لە ئاوێنەدا سەیری خۆم بکەم.

## 27

ئەو ژنەی کە خیانەت دەکات دەشێت هەر جۆرە روو و رووخسارێکی هەبێ تەنیا ئەو رووخسارە نەبێ کە مەنیجە هەیەتی. ئەو ژنەی کە خیانەت دەکات ناتوانێ وەکو مەنیجە بە خەمی هەموو کەسێکەوە بێ. ئەو ژنەی کە خیانەت دەکات ناتوانێ میناکی مەنیجە بۆنی قژی کیژەکەی بکاتو ماچی بکات.

دەڵێت "بۆچی بە خۆت ڕاناگەی؟" بۆچی لەمماڵە نایەیتە دەرەوە؟ بۆچی نایەی بۆ ماڵی ئێمە؟ شەقامێ، جادەیێ، پارکێ؟"

بە دەم پێکەنینەوە قاپە کێکەکە لەسەر مێزەکە دادەنەم.

"قەل بە قەل دەڵێ رووت ڕەش بێ".

خۆی لە گێلی دەدا کە گوایە گوێی لێنەبووە.

"بەجۆرە زۆر بێتاقەتو دڵ مردوو دەبیت."

دەڵێم "دەزانم، لێ مردوو بە چوونە پارك ناژێتەوە. بە ئارایشت-ش زیندوو نابێتەوە."

لە دەمم دەردەچێت "ڕەنگە بە ئاشق بوون بژێتەوە".

بە ئاستەم سوور دەبمەوە.



بە گومانەوە نیگام دەکات. نازانم گومانی لە من کردووە یان لە خۆی.

دەڵێت: "جا ئەشق کوا."

"وەکو ئەمیر قسە دەکەی. ئەمیر باوەڕی وایە ئەشق بەشەران رزگار دەکات، بەڵام لێرە کەس ناتوانێ کەس رزگار بکات. خەڵکانی نەگبەتو بەدبەخت پەیوەندی دەگەڵ یەکدا دەگرنو ناوی دەنەن ئەشق. لێ ئەمە زیاتر هەرزەییە تا ئەشقو خۆشەویستی بێ".

ئەمجا نۆڕەی مەنیجەیە کە سوور بێتەوە.

"هەرزەیی نیە".

حەز دەکەم بزانم ئەدی چیە؟

دەخوازم لە جیاتی چا، قاوەی بۆ دەم بدەم. بەڵام دەمەوێ جارێ رووی بکرێتەوە.

بۆ وەی بیهێنمە قسان دەڵێم "لەوەیە هاودڵی بێ، لەو وردە هاودڵیانەی کە وەکو سەفەرانی کورتە".

دەکەومە بیری سەفەرە خەیاڵیەکانی خۆم "ناشێت ناوی سەفەریان لێ بنەی، چوونە تا تۆزێك هێوەی پارکەکە."

ئاهێك هەڵدەکێشێت "نازانم".

ئێستا نۆرەی منە کە گومان بکەم. لەوەیە مەنیجە ئەو شتەی نەبێ کە من وا وێنا دەکەم وەکو جەواهیر قایمی کردووە. تەنیا مێردێکی نەخۆشی دڵڕەشی خانەگومانی هەیە.

کەواتە با قاوەکەی بۆ دروست بکەم. بە دەم ئەم کارەوە، گۆرانی دەڵێمو بەپێ خاوسی بە موبەقەکەدا دێمو دەچم. مەنیجە

پێشدەستیەکەی بەردەمی هەڵگرتووەو تا نزیکی دەموچاوی هێناویەتیو چاوی بڕیوەتە گوڵەکانی. منداڵەکان بە دەم هەراو زەناوە گەمان دەکەن.

دەڵێت: "ئەم پێشدەستیە نەوعێکە".

لە مەبەستی تێناگەم، دەڕوانمە دەوریە چکۆلەکەی دەستی.

پێدەکەنی.

"ئەو دەڕوات. دەزانی کە دەڕوات. تۆ زووتر ئەم کارە دەکەی، بەر لەوەی کە بە تەنیا بمێنێتەوەو بدۆڕێیت".

بە پێشدەستیەکە خۆی باوەشێن دەکات.

هەستدەکەم کە نابێ هیچ قسەیەك بکەم. متمانە کەمە. لەوەیە بترسێتو میناکی کیسەڵ سەر بەرێتە قاوغەکەی خۆی. سەرێك دەلەقێنم و وا دەنوێنم کە لێی دەگەم، بەڵام لە ڕاستیا لێی تێ نەگەییوم. بۆیە دوای چەند دەقیقەیەك دەڵێم "بە ماڵ گۆڕین نابێت، لە ماڵەکەی تریش، هەمان کێشەو ئاریشەت هەن".

"تۆ لە کوێ دەزانی؟"

ڕاست دەکات. من لە کوێ دەزانم؟ مەگەر چەند جار ماڵم گۆڕیوە. لە کوێ دەزانم لە ژیانێکی تردا چۆن دەبم؟



## 28

شادی مەشق دەنووسێتەوە "دایکە تۆ کە گەورە بووی، دەتەوێ ببی بە چی؟"

دەڵێم "قەڵەمەکەت مەخۆ".

قەڵەمەکە لە زاری دەردێنێ "دەی، بڵێ".

"من گەورە بووم".

ئێستا قەڵەمەکەی خستووەتە بەینی ئەنگوستانی پێی.

"بووم بە وەی کە دەمویست."

شادی قەڵەمەکە بە بەینی قامکی دا ڕەت دەکات.

"دایکە..."

پەرچەمەکەی لەسەر هەنیەی لا دەدات.

"قسەی خۆڕاییی مەکە".

بیر دەکەمەوە "ئێ.. دەمەوێ، دەمەوێ..."

لە پڕ لە دەمم دەردەچێت "ببم بە سەماکار".

ئەمیر سەری لەسەر ڕۆژنامەکەی هەڵدەبڕیو تەمەشام دەکات. قسەکەم دووبارە دەکەمەوەو دەڵێم با شاهین کاسێتێك بخاتە سەر

تەسجیلەکە، تا لە ئێستاوە مەشق بکەم. هەڵدەستمو دەکەومە سەما. هەوەڵجار لاسایی مهین دەکەمەوە. منداڵەکان پێدەکەنن. چەپڵە لێدەدەن، شادی وەکو مەیموون دەکەوێتە هەڵبەزو دابەز. منداڵەکان داوای سەمایەکی دی دەکەن "پورە ئەشرەف".

میزەکە رادەکێشمە لاوە تا شوێنێکی زیاترم هەبێ. منداڵەکان وازیان لە دەرسو مەشقەکانیان هێناوە. ماڵەکە پڕ دەبێت لە هەراو زەنا.

ئەمیر دەڵێت: "ئەگەر بتگوتایە لێبوك، باشتر بوو".

ئێستا واز لە لاساییکردنەوە دێنمو میناکی چەند ساڵێکی پێشووی خۆم سەما دەکەم. بەجۆرێ هاتوومەتە سەر شەوقو زەوق لە تۆ وایە لە جێیەکی غەریبو تایبەتدا سەما دەکەم. بۆ چەند ساتێك لە بیرم دەچێت کە لە کوێم. بەجۆرێ گوڕم بەستووەتەوەو کەوتوومەتە سوڕو بادان کە کەس بە تۆزی پێما ناگات.

لە پڕێکا دەوەستم "یانی من بووم بەوەی کە دەمویست؟"

بە دەستە والاکانمەوە رێك شێوەو بیچمی بوکەڵەیەکم وەرگرتووە کە لە پڕێکا کۆکەکەی تەواو بووبێ.

شاهین هاوار دەکات "دەبێ دایکە سەما بکات".

منداڵەکان دەیکەن بە هەراو هەنگامە. دەنگیان داوەتە تەسجیلەکە، دادەنەومەوەو وەکو ئەو کاتانەی کە لە گەرماو دێمە دەرێ قژم بە پاشو بە پێشا تەکان دەدەم. سەر لە نوێ دەست پێدەکەمەوەو لە جاران توندتر سەما دەکەم.



## 29

"دایکە، ئەمیر دەڕوات".

"باڵندەکەی رۆییوە. خۆیشی ناتوانێ بیهێنێتەوە. دەبێ دوای باڵندەکەی بکەوێ، لێگەڕێ با بڕوات".

دایکە دەڵێت هەر کەسەو باڵندەیەکی هەیە. ئەگەر بفڕێتو بڕوات لە هەر جێیەك بنشێتەوە، خاوەنەکەشی بە دووی خۆیدا بکێش دەکات.

باڵندەکەی ئەمیر لە شاری باکۆیە. لە پێش خۆیەوە رۆییوەو چاوەنۆڕی ئەوە. باکۆ، ئیڤرست نیە. نزیکترە. بە ترومبێل چەند سەعاتە رێیەکە.

"نامەتان بۆ دەنووسم. تەلەفونتان بۆ دەکەم. مانگی جارێکیش دێمەوە بۆ لاتان".

"مەڕۆ ئەمیر. من ناتوانم، منداڵەکان بچووکن."

"بیر لە ئایندەیان بکەوە. دنیا هەر ئەمڕۆ نیە. سبەینێ ئێمە دەرەقەتی سادەترین پێویستیان نایەین. ئیدی ئەم دەرفەتانەمان دەست ناکەوێ. رۆییشتن تاقە رێگەی رزگارییە".

"لێرە کار بکە. شەوان وەرە ماڵەوە".

ئەمیر، بەبێ قسە لە باوەشم دەگرێت. بڕیاری خۆی داوە. دەزانم کە باڵندەکەی بەر لە خۆی ڕۆییشتوەو لەبەر میترۆکەی باکۆدا چاوەڕوانیەتی، دەخوازێ هەڵفڕێ. شوێنانی تازە بدینێ. ژیانێکی دی تاقی بکاتەوە.

"تۆش بژی. ئەوەندە وابەستەی من مەبە. پارەتان بۆ دەنێرمەوە، ئاگات لە منداڵەکانیش بێت".

جانتاکەی دادەخاتو بەفیکە گۆرانیەکە دەڵێت. گۆرانیەکە، بۆ من نیە. ئەمیر دەتوانێ چاوپۆشی لە من بکات، بەڵام بۆچی من ناتوانم کاری وا بکەم. ناتوانم. لە ئێستاوە داماوی عەسرانی دوورو درێژی بێ ئەویم.

"ئاینده تاریکه، زۆر تاریکە. تاقە ڕێگای رزگاری، کاری منە. ئەویش تا گەنجم هێزو شنگم تیایە، وزەو تاقەتم تیایە. هیچ ڕێگەیەکی دیکە نیە. دەبێ بڕۆم".

باڵندەکەی ئەمیر بەر لە خۆی بۆ باکۆ ڕۆییوەو چاوەنۆڕی خاوەنەکەیەتی.



## 30

شەهلا ڕێژیم دەکات. زەڵاتەی بێ ساسو سەوزەی لەگەڵ شویتدا بۆ دێنم.

باسی نەخشەی خانووەکەی ئێمە دەکات.

"تەوالێتەکەی دوور لە چاوو لە پاڵ حەمامەکەدا دروستکراوە. شتێکی باشە."

هەواڵی هاوکارانی دایەرەکەی دەپرسم، لێ شەهلا سوورە لەسەر ئەوەی باسی تەوالێتو دەستشۆریەکە بکات. باسی سیفۆنەکەی وماقیولیەتی شوێنەکەی دەکات.

نابێ پێش شەهلا بکەوی. دەبێ سەبر بکەیتو پێ بە پێی ئەو بڕۆیت.

"دەتوانی تەوالێتێکی فەرەنگیش دابنەی."

شەهلا بۆ هەر شتێك ڕێوڕەسمی خۆی هەیە. دابو نەریتێکی تایبەتی هەیە. دەبێ ئەنجامی بداتو پاشان بەمەبەستی خۆی بگات. گوێم قولاغ کردووەتەوە تا سەر لەم ڕێوڕەسمە تازەیەی دەربکەم. هەمیشە یاساو ڕێساو ڕێوڕەسمی خۆی هەیە. دایکم دەڵێت:

"کە منداڵیش بوو قاپی تایبەتی خۆی هەبوو ماڵەباجێنەکانی ئەوەندەی تەشریفاتو ڕێوڕەسم هەبوو کە منداڵەکان ماندوو دەبوونو

ناچار دەبوو لە کۆتایی یاریەکەدا خۆی پێشوازی لەخۆی بکات. لە کاتی خەودا سەد کەڕەت جێگاکەی دەگۆڕی.

تا ئێستاش بەرزیو نزمی سەرینەکەی بەقەد مەرگو ژیان بەلاوە گرینگە. ئەگەر چەرچەفو سەر ئەندازی تایبەت بە خۆی نەبێت زۆر بە ئاسانی دەتوانێ چاوپۆشی لەو سەفەرە بکات کە هەموو شتێکی سازو ئامادەیە.

"کە لە ماڵەوەم دەتوانم بخوێنمەوە. فریای حیسابو کیتابی خۆم بکەوم، گوێ لە نوچەو هەواڵان بگرم، بە مەرجێ لەو کاتەدا دایکم لە تەوالێت نەیەتە دەرێو چەند قەترە ئاوێك بە پاوپوزییەوە بێت. دەبێ وشکی وشك بێت".

مۆڕەیەکی لێدەکەم. دەڵێت:

"پاوپوز دەڵێم. پاوپوزی تەڕە نارەحەتم دەکات. دەزانی ئەو چەند قەترەیە چیم بەسەر دێنێ؟ تۆ نازانی کاتێ نارەحەت دەبم چیم بەسەر دێت".

دەزانم کاتێ کە نارەحەتو نیگەران دەبێ بە جۆرێ بەر دەبێتە زیپکەو جوانە زووەکانی دەموچاوی کە زیپکەکان ژێوان دەبنەوە لەوەی کە لە دەموچاوی ئەو دەرهاتوون. لەبەر ئاوێنەدا دادەنیشێتو بە جۆرێ ژێر بڕۆکانی هەڵدەگرێت کە رەنگی لە باقی دەموچاوی رۆشنتر دەبێت. نینۆکەکانی ئەوەندە لە بڕبەند دەدات کە وەکو پاندانێکی بێ مەرەکەب دەچن.

سەری کونو کەلەبەری ماڵەکە دەداتو دیسان دەکەوێتەوە باسی دەست شۆرو تەوالێتەکە. ئومێدێ پەیدا دەکەم، چونکە بابەتێك



هاتووەتە پێشی، بتوانم دەبارەی ئەو بابەتە دەگەڵ شەهلادا قسە بکەمو باسێکی ئەمیریش بکەین. بابەتەکەش ئەوەیە کە هێشتا نەمتوانیوە بە رۆییشتنی ئەمیر قاییل ببم. کەنەدا وەکو باکۆ نیە کە هەر کاتێ ویستی بتوانێ بێتەوە. کەنەدا لەوپەڕی دنیایە، و دنیا تەنیا بۆ پارەداران بچووك بووەتەوە. بۆ ئێمەمانان هێشتا گەورەیە، زۆر گەورەیە. خەریکم دەچمە وردکاری بابەتەکەوە کە شەهلا بەرخەبەبەی وەردەچەرخێنێو بەرەو لای تەوالێتەکە دەڕوات. بەرخەبەبەی شەهلا زیادە گۆشتێکی بێ کەڵك نیە کە بە ژێر چەناگەیەوە شۆڕ بووبێتەوە.

جوڵەیەکی ناسکی بەرخەبەبەی دەتوانێ ئەوەت تێبگەیەنێ کە خاوەنەکەی تاقەتی ئەوەی نیە گوێ لە حیکایەتێن سۆزداریو پڕ ئاهوناڵە بگرێتو بڕیاری بەرو دوای ئەوەیە کە باسی دەستشۆرو تەوالێت بکات.

شەهلا کاری بە هیچ شتێکی جیهانەوە نیە. هەستی خەڵکانی دیکەشی ئەوەندە بەلاوە گرینگە بشێ بکرێ بە نموونەو کلێشەی خەیاتیەکەی. شەهلا نموونەو رێساو ئەتەکێتو بەرنامەو میتۆدو لۆژێکی هەیە.

ئەگەر خۆشکایەتی شەهلات گەرەك بێ، دەبێ لە پێشەوە یاساو رێساکانی ئەوت قەبوڵ بێ. سەردەمانێ باوەڕدارێکی دوو ئاتەشە بوو و سەردەمانێ لایەنگرێکی دڵگەرمی هەر جۆرە هەڵبژاردنێکی ئازادو سەردەمانێ گیا خۆر بوو. لە دوای مەرگی باوکە گیان دەستبەرداری هەموو خووخدەو رێورەسمەکان بوو، نەبوو بە موریدی هیچ پیرێك، ماوەیەکی زۆر وەکو کەسێکی ئاسایی، بێ هیچ تایبەتمەندییەك، مایەوە.

بەڵام ئەمەش لەسەر دەستی ئەوا بوو بە جۆرە کارێکی قورس. بۆ نزیك بوونەوە لەو هەبوونی هەر جۆرە خەسڵەتو تایبەتمەندییەك، عەیبو ئیرادێکی لە تەحەمول بەدەر بوو.

"ناتوانم تەمەشای تەلەفزیۆن بکەم. هەموو حەواسم لەلای ئەو بەلەکە تەڕەیە. ناتوانم ئارایشت بکەمو بۆنێکی خۆش لە ژوورەکە بەو هەموو عەترو سابونەوە، نایەت. هەندێجار بە من بێت هەرچی شت لە ژوورەوە هەیە توڕی بدەمە دەرەوە".

شەهلا ژێر زەمینەکەی والێکرد، ڕۆژێك دەڵاڵی هێناو هەموو شتەکانی ناو ژێر زەمینەکەی توڕدایە دەرەوە. سەندووقەکانی وێڕای دادو بێدادی دایکە، دا بە کۆنە فرۆشەکەی گەڕەكو لە جیاتی سەندوقەکان ڕەفەی ئاسنی کڕیو لەسەروی تەختەکەی باوکە گیان کە ئێستا گوێزرابووەوە بۆ ژێر زەمینەکە، داینا. دەرمانەکانی باوکە گیانی لەسەر ریز کرد. ژێر زەمینەکە لە خەستەخانەیەکی سەفەری دەچوو کە لە نێو سەنگەرێکی ناوەندی مەیدانی شەڕدا دروست کرا بێت. پاشان بۆن بڕەیەکی کڕی کە هەموو ڕۆژێ وەکو نووسینی دروشمێکی ترسناك بە پەلە لە دەرگای ژێر زەمینەکەی دەدا.

"تەوالێتەکەی ئێمە لەبەر چاوە، ڕێك لە پاڵ موبەقەکەیە".

وەکو ئەوەی. ماڵەکەیم نەدیتبێ.

"تەلەفزیۆنەکە لە شوێنێکە ڕێك بەرانبەر بە تەوالێتەکە، هەر کەسێك لە تەوالێتەکە بێتە دەرێ تۆ دەی بینی، ناکرێ نەی بینی".

وەکو ئەوەی دڵی لە شتێك تێك هەڵبێ، موچوڕکەیەکی پێدا هات.



"پیری شتێکی خراپە، حەزدەکەم تەنیا ئەو کاتە بژیم کە ساغو سەلامەتمو کۆنترۆڵی هەموو ئازام لە دەستی خۆمدایەو بەوپەڕی خاوێنی لە تەوالیێت بێمە دەرێ".

شەهلا دەرکەی تەوالێتەکە دەکاتەوەو بە چاوی کڕیاری سەیری ناوەوەی دەکات.

"دیقەتت داوە سۆندەی تەوالێتەکە لە کوێ قایم کراوەو بەکارهێنانی چقاس ئاسانە. تەنانەت منداڵێکیش دەتوانێ خۆی بە ئاسانی پاك بکاتەوەو بشوات چ جای خەڵکی گەورە".

سەری بۆ دەلەقێنم، وا هەست دەکەم بە عەمراتم بیرم لە سۆندەی تەوالێتەکە نەکردووەتەوە.

شەهلا دەڵێت کە دەرگای تەوالێتەکەی ئێمە وەکو هی تەوالێتەکەی ئەوان نیە کە دەرگاکەی هەر چەند جوانە لێ بەڕادەیەك باریکە کە بە هەزار زەحمەت لێوەی دەچنە ژوورێو دێنە دەرێ.

دەموچاوو بەرخەبەبەی بۆ لای من وەردەگێرێت و دەڵێت "لەوەی پتر تەحەمول ناکەم. دایکەش حاڵی بووە. چیتر هەڵناکەم."

# 31

دایکە گوتی: "ئیدی ناتوانم".

لەگەڵ باوکە گیاندا نایکرێ.

باوکە گیان لە ژێر زەمینەکەدا بەند نەدەبوو. دەیویست بڕوات.

"دەخوازم بڕۆم لەو شتە ڕەشە درێژانە بکڕم".

مهین گوتی: "من نۆشابەت بۆ دەکڕم".

"نا، دەبێ بچم بۆ ئەوێندەر".

"ئەوێندەر کوێیە؟"

ناوی ئەو شوێنەی کە دەیویست بۆی بچێ، بیر نەدەکەوتەوە، گوتی یارمەتی بدەین تا بیری بکەوێتەوە. ناوەکە وەکو شتێکی تیژ لەسەر نوکی زمانی بوو. زمانی دەتگوت دەکزێتەوە کەوتبووە لاڵە پەتە.

پێی نایە سەر تاکێك لە پێڵاوەکانیو چاکەتەکەی بەشانیادا.

"دەبێ بۆ ئەوێندەر بڕۆم".

"ئەوێ چ گۆڕێکە؟"

دەستی مهینی گرت

"بمبە".

"ئاخر بۆ کام گۆڕستانت بەرێ؟"



دایکە پەستو وەڕەز بوو بوو.

"ئاوی هەیە. تاریك نیە".

گوتم "پارك؟"

دووبارەی کردەوە "پارك، پارك".

گوتی جارێکی دی دووبارەی بکەمەوە

"نا، نە ئەمە نیە. ئاوەدانیە".

دایکە کێشای بە سەرینەکەیدا

"ڕاکشێ".

باوکە گیان بە ترسەوە ڕوانیە دایکەو توندتر دەستی مهینی گرت.

"من دەبێ بڕۆم".

دایکە هاواری کرد.

"بڕۆ، بڕۆو ڕزگارمان بکە. دەبڕۆ. یاڵڵا هەستە، بڕۆ، دەڕۆی بە جەهەنەم".

باوکە گیان نیگای یەك بە یەکمانی کرد. بە شێوەیەکی سەرڤە سەرڤەو بێ ئەوەی بە باشی بمان ناسێت. زاری نیمچە کراوە بوو، و دانە عەمەلیەکانی بە دەرەوە بوون. چاوەکانی بچووك بوونەوە. هەموو تەمەشامان کرد. خەریك بوو دەگریا.

## 32

"تۆ لەزگەی، لەزگە".

من چاوەڕوان دەکەم. کە ئەمیر دێتەوە دەبم بەلەزگە و لێی نابمەوە.

"مەڕۆ، لێرە وەمێنە، من بە تەنیا هەڵناکەم".

ئەمیر، چالاکو لەزگێنو پڕ وزەو تاقەتو رووخۆشو پڕ ورەیە، خێرا خێرا و توند دەموچاوم ماچ دەکات.

"رۆژێك دێ ئێوەش دەبەم".

"نا ئێستا بمانبە".

دەپاڕێمەوە. ئەمیر تووڕە دەبێت.

"ئەوەندە بە منەوە مەچەسپە. بە دیار تۆوە دانیشم چ بکەم؟ لە برسا بمرین؟ نابینی بەرەو کوێ دەڕۆین؟ کوێر بووی؟ رۆژانێکی ترسناکمان لە پێشە. رۆژانێکی ترسناکو تاریك".

لە ماڵ دەچمە دەرێ. ئەگەر لەوە پتر لە ماڵەوە بمێنم لە خۆم، لە ئەو، لە ماڵەکەو تەنانەت لە منداڵەکانیش بێزار دەبم. شیرو خواردنی منداڵەکان دادەنەمو بە ئەمیریان دەسپێرم. دەبێ بجوڵێم، دنیا خەریکە تاریك دەبێت.



منداڵە لەزگەکانم بە نیگا دوام دەکەون. ئەمیر دەبێ بیان خافڵێنێ تا من لە دەرگا وەدەربکەوم. لێ شادی پێدەزانێو دەزریکێنێ.

لە دوێ شەوەوە لەیەکبینە بەفر دەبارێ، دنیا تاریك بووە. بە چەند کۆڵانێکا تێ دەپەڕمو دەگەمە سەر شەقامە سەرەکییەکە. شەقامەکە رووناکە، و گلۆپی قەیسەری مەیدانەکە لە دوورەوە دیارە. بە گۆشەی شاڵەکەم دەمم دادەپۆشمو بەرەو دەنگو روناکییەکە دەڕۆم. کە ڕێ دەکەم نیگەرانیەکەم کەم دەبێتەوە. چەند خۆشە ئینسان لە منداڵەکانی دڵنیا بێتو بۆ خۆی پیاسە بکات، ئەگەر لەم کەشە ساردو لەم بەفرەش دا بووە کە زوو دەتوێتەوەو دەبێ بە قوڕاو. لە مێژە بە تەنیا لە ماڵ نەهاتوومەتە دەرێ. لێرەوە بگەڕێمەوە باشتر نیە؟ نا، ناگەڕێمەوە.

من لەزگەم. دایکم لەزگە نیە. باوکە گیان پێی دەگوت "جوانە، بەڵام نەچەسپە."

قەت بە شتێکەوە نەچەسپیوە، نە بە باوکە گیانەوە نە بە ماڵەوە، نە بە منداڵەکانیەوە. کاتێ کە لە تەنیشتیەوە دادەنیشتین، بێ تاقەت دەبوو.

"خۆت بەسەر منا مەدە، بچۆ ئەولاوە"

حەزی دەکرد لە شەقامدا بە تەنێ ڕێ بکات. لە گەرماودا ئێمەی لەسەر سەکۆی گەرماوەکە دادەنیشاندو بە حەمامچییەکەی دەسپاردین. خۆی دەچووە ژوورەوەو پاشان یەك یەك بانگی دەکردین. کە باوکە گیان لە ماڵ نەبووایە، نوێنەکانی خۆی کەمێ دوور لە ئێمە ڕادەخستو کاتێ لە ماڵیش بوایە، دوور لە دۆشەکەکەی باوکە گیان ڕای دەخست. کە سواری پاس دەبوو، حەزی نەدەکرد بەدەنی بەر بەدەنی ژنانی دیکە بکەوێ.

ئێستا لە ناو مەیدانەکەدام. وەکو هەمیشە قەرەباڵغ نیە. چەند ژنێکی میکاج کردوو لەبەردەم جامخانەیەکدا وەستاون. قسە دەکەن و پێدەکەنن. ناو قەیسەرییەکە گەرمە، دوکان و موغازەکان پڕ روناکین. بە پلیکانە کارەباییەکەدا سەر دەکەوم و لە پلەکانی پشتەوە دادەبەزم. بە نێو قەرەباڵغیەکەدا رێدەکەم و ناچار دەبم بە ئەسپایی ڕێ بکەم. ترسم لە دەرێی قەیسەرییەکە بەجێهێشتووە.

هەموان زندوون. رێدەکەن، قسەکەدەن و پێدەکەنن. هیچ کەسێك گوێ بە من نادات. خۆم بە موغازەیەکدا دەکەم سەوای کڵاو قۆچکەیەکی منداڵانە دەکەم. دەموچاوم گەرم دا هاتووە، هەموان دەژین، هەموو هەر زندوون. تەنیا من مردووم. چونکە هیچ شوێنێك شك نابەم بۆی بچم، ناچارم  لە چوار دیواری ئەو ماڵەدا بە تەنێ بمێنمەوە، لەگەڵ منداڵانێکدا کە ئاگایان لە هیچ شتێك نیە. تەنیا شیریان دەوێ. خواردنیان دەوێ. جلکی خاوێنیان دەوێ. گەمە و یاریان دەوێ.

لە خەیاڵی خۆمدا ئەمیر لە ماڵەکە دوور دەخەمەوە. ئەو پێویستە بڕوات، لەبەر ئایندە. خۆم لە چەقی ماڵەکەدا دەدانەم. بەڵام من دەبێ بمێنەوە. ناگرێ بە دوو منداڵی بچووکەوە بچی بۆ غەریبیی و ئاوارەبیی. کەواتە چارم هەر مانەوەیە.

لێ شەو درەنگ دێ و رۆژ هەر نابڕێتەوە. ئەمیر بە دووی ئایندەدا دەڕوات. هیچ گرەنتیەکیش نیە. لەگینە ئایندە دەگەڵ خۆیدا بێنێ و لەوەشە لە هێنانی ژێوان ببێتەوە. رابردوو وێرانەو هیچی لێ چاوەڕوان ناکرێ، هیچ کۆمەکێکی لێ چاوەڕوان ناکرێت. ماڵەکە، ماڵە هەژارەو بۆنی حەبی تا ڕەوێن و شیری منداڵی لێدێت. سەر فەرشەکە پڕە لە



گەمەو یاری منداڵان. دەبێ یاریە وردەکانی جیا بکەمەوە. لەوەیە شادی بیانخاتە دەمی و قوتیان بدات.

لە قەیسەرییەکە دێمە دەرێ. درەنگ بووە. بەفر هێشتا نەرم نەرم دەبارێ، پیاوێك چەوەنەر دەفرۆشێت. هەڵم لە چەوەنەرە سوورەکان هەڵدەستێ. دەوروبەری مەیان پڕە لە پیکاب. پێکابێن تەژی لە لالەنگی و لیموی شیرین و پڕتەقاڵ. بە دەوری مەیانەکەدا دەسوڕێمەوەو خۆم بە کۆڵانەکەدا دەکەم. دەنگەکان دوور کەوتوونەتەوەو ناو کۆڵانەکە بێدەنگ و تاریکە. تەنیا سپێتی بەفرەکەو رۆشنایی چەند گڵۆپێك دیارە. وریام، بەڵام پێم دەخزێ و دەکەوم. هیچ کەسێك لە کۆڵانەکەدا نیە. دەبێ هەستمەوە. پشتم ئازاری پێ گەییوە. چنگ لە بەفرەکان گیر دەکەم و فرمێسك لە چاوم دێت. ئەو هەموو روناکی و ڕەنگ و سەدایەش نەیتوانیوە ئەو شتە لە دڵم دەربێنێ، کە هەنووکە خەریکم وەکو خواردنێکی هەرس نەبوو هەڵی دێنمەوە. ئێستا دەزانم بۆچی بەمە درەنگەشەوە هاتوومەتە دەرێ. هاتووم تا تەنیا بم و لە تەنیاییدا گوێم لە دەنگی خۆم بێ، گوێم لەو سوێندە بێ کە دەیخۆم، سوێند دەخۆم کە چیتر چەسپ نەبم، قیروزفت نەبم، لەزگە نەبم. سوێند دەخۆم کە هەرگیز ژنێکی چەسپی، چەسپ ئاسا نەبم. هەڵدەستمەوەو بەرە و ماڵ نشێو دەبمەوە.

# 33

دوو ڕۆژە کە هەگبەکەی ئەمیر بە تاڵە. نە واریقاتو ڕووداوێکی تیایە نە هەواڵێك. شیوەکەی دەخواتو زەق زەق چاو دەبڕێتە شاشەی تەلەفزیۆنەکە. قسە دەکەی گوێت لێناگرێت. پرسیار دەکەیت وەڵامت ناداتەوە. ڕۆژی سێیەم لەسەر بیانوویەکی چکۆلە لە شادی دەداتو بەسەر مندا دەبۆڵێنیٚ کە بەم گرانییە زیادە مەسرەف دەکەم. نۆرەی منە. کە هەستمو بڵێم کام پارە؟ کام مەسرەف؟ و بڵێم چەندین مانگە بەم جلە کۆنانەوە ڕادەبوێرمو ورتەم لێنایەت.

"پێم بڵێ بزانم چ کەرەسەیەکی میکاجو ئارایشتم کڕیوە؟ کامە جانتام کڕیوە؟ چ شتێکم بۆ منداڵەکان کڕیوە؟"

نۆرەی منە، بەڵام نۆرەکەی خۆم دەدەمە ئەو تا قسە بکات. تا دیسان ببۆڵێنیٚ. هاوار بکات. لەوەیە لە بەینی قسەکانیا بۆم بە دیار بکەویٚ چ شتێك ڕوویداوە. بەڵام ئەو قسە ناکات. چۆن بتوانم سەرێك بکێشمە دنیای ئەو؟ ئاماژە بۆ منداڵەکان دەکەم کە بێدەنگ ببن. دەبیٚ جەوەکە هێوەر بکەمەوە. دەبیٚ کارێکی وەها بکریٚ ئەمیر بەخۆی بێتە قسە. جێگەکان ڕادەخەم. بە منداڵەکان دەڵێم بە بێدەنگی بچنە سەر جێی خۆیان. دەنگی تەلەفزیۆنەکە کزدەکەمو بە دیار سەری ئەمیرەوە دادەنیشم.



بە دەما خەوتووە. شانو ملی دەشێلم. ئەمیر عەسران بە منداڵەکان دەڵێت ئەگەر شانو ملی بشێلن پارەیان دەداتیٚو بۆ پارکیان دەبات. چاوانی نوقاون. فایدەی نیە. خەوتووە.

لە دڵی خۆدا بیردەکەمەوە چەند گەوجم کە وا وێنا دەکەم ئاگام لە هەموو شتێکی ئەمیرە. کە دەماری دەناسم، کە وەکو ناو لەپی دەستم دەیناسم. کە ژیانی ئەو شتێکی تیا نیە کە سەری لیٚ دەر نەکەم. سەرو سیمای ئەم پیاوە گرژو مۆنو ماندووە هێندەی دی نا ئاشناتر دەبێت.

دەقاودەق وەکو ئەو کاتەی کە باوکە گیان دوای شەوو ڕۆژێك دەهاتەوەو ئیدی ئەو پیاوە نەبوو کە لە ماڵ چوو بووە دەر. بە هیچ جۆریٚ نەدەتوانرا ئەوە بزانریٚ کە لەو شەوو ڕۆژەدا چی بەسەر هاتووە. چۆن ڕۆژی لیٚ بەسەر چووەو بە درێژایی ئەو شەوو ڕۆژە چ بەشەرێك بووە.

ئەمیر بابایەکە غەوارەو غایب. هەر چۆنیٚ سەر دێنیو سەر دەبەی ناتوانی تەسەوری ئەوە بکەیت ئەمڕۆکە مرۆڤێکی بەختەوەر بوو بیٚ. ئەگەر بەختەوەر بوایە پریشکێکی بەر ئێمەش دەکەوت. باوکە گیانیش کاتیٚ دەگەییەوە ماڵ وەکو بازرگانێك کە لەو دەمەدا هەواڵی نابووتی خۆی زانیبیٚ، ماتو خەمبار لە نێو چوار چێوەی دەرگاکەدا دەردەکەوت.

لە پاڵ ئەمیرا ڕادەکشێم. ئێستا من بۆ ئەمیر نەژنم، نە دایك، نە خوشك. هیچ پەیوەندییەکمان بە یەکەوە نیە. ڕوناکی ساردو سپی تەلەفزیۆنەکە وەکو بلاجکتۆرێك لە هێڵی دژمنەوە کەوتووەتە سەرمانو عەوداڵی شناسایی ئێمەیە کە وەکو دوو غەوارە لەسەر مافورەکە لێی کەوتووین. خۆم بە ئەمیرەوە دەچەسپێنمو توند شانەکانی دەگرم. وەردەسۆڕێتو بە دەم خەوەوە لە هەمێزم دەگرێت. ئەمێستا نە ئەو مێردەو

نه من هاوسەر. نه ئەو پیاوەو نه من ژن. دوو بنیادەمین به پاڵ یەکەوەو پەناهەندەی یەکتری.



## 34

شەهلا، مهینو دایکه گەرەکیانه برۆن. دوای نیوەڕۆ هاتوونو ئێستا شەوه. هەوەڵی شەوه، تۆزێك دوای رۆژاوا. شاهین خۆی به بازووی مهینەوه هەڵواسیوه "منیش بەره."

شادی قامکی دەخوات. دایکم بەدەنه قورسەکەی هەڵبڕیوەو کراسەکەی چاك دەکات "ئەگەر دەترسی لێرەوه دەمێنمەوه".

"نا، نا ناترسم".

مهین به شاهین دەڵێت: "برۆ جلەکانت بگۆڕە، وەره با برۆین".

شەهلا لەبەر دەرگا ئەم پێو ئەو پێ دەکاتو پێڵاوەکانی دەسڕێت. پەلەیەتی. دەبێ فریای کارەکانی بکەوێ.

دەڵێت "نابێ، بیری دایکی دەکات، بیانوومان پێدەگرێت. ناتوانین نیوه شەو بیهێنینەوه".

مهین دەڵێت "شاهین منداڵ نیه. پیاوێکه"

دەڵێم "مهین گیان پێویست ناکات. بردنو هێنانەوەی زەحمەته".

شاهین دەگری.

دایکم دەڵێ

"ئاخر ئەگەر تۆ ببەین، دایکت به تەنیا دەبێ".

شاهین دەگری. دایکم پارە لە جانتاکەی دەردێنێ. شاهین پارەکە تور دەدات.

دایکم دەڵێت "زۆر باشە، برۆ جلەکانت بگۆڕەو وەرە".

شاهین چەکمەجەی جلەکانی هەڵڕشتووە.

"دایکە کوا گۆرەوییەکانم؟"

تاکێ لە گۆرەوییەکانی بە نیوە چڵی لە پێ کردووەو تاکەکەی تری بە دەستەوەیە. نیگای من ناکات. شەرمەزاری ئەوەیە کە دەڕوات. دێتە هۆڵەکەوە. وام بە خەیاڵدا دێت سەقفی ژوورە زیادەکە بەرزەو روناکیەکەی کەمە.

سێبەرێن ئاوێزەکە کەوتووەتە سەر دیوارەکان. شێرەی موبەقەکە تکە دەکات. شادی توند دەستی منی گرتووە.

دەڵێم "شاهین گیان، سبەینێ خۆم دەتانبەمە دەرەوە.

شاهین ژوورەکان دەگەڕێ، هەروەها تەوالێتەکە. لە ڕاڕەوی قاڵدرمەکانەوە تەمەشا دەکات، هیچ کەسێك دیار نیە. لە پەنجەرەکەوە تەمەشا دەکات، باڵای ناگات کە دانەوێتەوەو بنی کۆڵانەکە بدێنێ. بۆ ژوورەکە دەگەڕێتەوە. بە لەقە دەکێشێت بە دەرگا داخراوەکەداو هاوار دەکات "بێ شەرەفینە".



# 35

هەست بە بوومەلەرزەکانی ئەم ژیانە دەکەم. بۆنی جودایی دەکەم. ژیان دەگۆڕێت. لەوەیە هەرچیەك بکەین نەتوانین هەموومان بە کۆمەڵ وەکو ئێستا لە دەوری یەکدی خڕ ببینەوە. ئاش لێدەنەم، ئاشەکە ئەمیر دەخاتە بیری دایکی. ئەو دایکەی کە لە دوو وشەدا بەرجەستە دەبوو، فیداکارو زەحمەتکێش. لێ دایکی من لە هەزار وشەش دا جێی نابێتەوە، نایەتە پێناسەکردن. هێلکەو ڕۆنو ماکەرۆنی بۆ شاهینو شادی دروست دەکەم.

دەبێ هەمووان تێرو ڕازی لەسەر سفرەکە هەستن. دەبێ هەموویان لەزەت لە خواردنەکە ببینن. مەگەر هەموو هەوڵو کۆششی خەڵکی بۆ ئەو شتە نیە کە ئێمە هەمانە، خواردنی تەواوو پێکڤە بوون.

لە ماڵی ئێمەدا جەژنێکە کە تەنیا من لێی ئاگادارم. جەژن بۆ پاراستنی ئەم ساتە. ساتێك کە لەگینە سبەینێ دووبارە نەبێتەوە، لە ژێر پێیەکانمدا هەست بە بوومەلەرزەیەك دەکەم. بۆنی جودایی دەکەم.

بە حەوسەڵەوە گوێ لە نوکتە بێ تامەکانی شاهین دەگرم. شادیش نایەوێ لەو کەمتر بێت "کوڕێك لەسەر دەستەکانی دەڕۆیی. یەکێك پێی

گوت بۆچی لەسەر دەستەکانت دەڕۆیت. گوتی ئاخر باوکم گوتویەتی بۆت نیە پێ بنەیتە سەر شەقام".

شاهین دەڵێت "قاقا پێکەنیم!".

بەڵام من قاقا پێدەکەنم. ئەم ژنو پیاوە چکۆلەیە کە تۆزێکی ماوە بکەونە وێزەی یەکتری منیان نقومی لەزەت کردووەو ئەمیر نازانێ بۆچی حەزدەکات نوکتەیەك بگێڕێتەوە کە بەڕاستی پێکەنیناویو خۆش نیەو نازانێت بۆچی سەر دەکاتە سەر منداڵەکان. نازانێ بۆچی دەگەڵ شاهین دەست تێکەڵ دەکات تا بۆڕ بە شادی بدات. من دەبێ ئێستا ڕۆڵی هەمیشەییم ببینمو یارمەتی شادی بدەمو بڵێم ئەوەندە ناجسن مەبن.

ئەمیرو شاهین عینادی دەکەنو دەبن بە دێوی ڕاستەقینەو بەدەنگی بەرزتر پێدەکەنن. ئەمیرو شاهینو شادی نازانن لە جەژنو ئاهەنگێکدا بەشداریان کردووە کە من ڕێکم خستووە. ئەمە جەژنو ئاهەنگی ژیانەو تەنیا من کە لەسەر سفرەکە دۆش داماوم هەست بە تێپەڕبوونی سات بە ساتی دەکەم.



# 36

ئەمیر لە نامەکانیا باسی خەڵکی ئازربایجان دەکات، باسی باکۆ، بلوارەکانیو میترۆکەی، باسی موزەخانەو کتێبخانەکانی دەکات. لە وەڵامی نامەکانیا باسی ئاوو هەوای بۆ دەنووسم، باسی هەواڵی ڕۆژنامەکانو ئەو ئوتۆبانانەی کە شارەوانی خەریکی دروست کردنیانە بۆ دەنووسم. باسی ئەو فرۆشگایەی کە تازە کراوەتەوە، باسی لولەکێشی غازو باسی مەیدانی تەڕەباری بۆ دەنووسم.

ڕۆژێك لەو بەینەدا دەگەڵ منداڵەکاندا بۆ مەیانی تەڕەبارەکە دەڕۆین. چوون بۆ ئەوێندەر بۆ خۆی سەفەرێکە. چوونە بازاڕ بۆ خۆی سەفەرێکە. چوون بۆ ماڵی شەهلا کە لەو سەری شارە بۆ خۆی سەفەرێکە. جانتاکەم پڕ دەکەم لە تێشوو، شەربەتی لیمۆ، میوە، نوقڵو چکلێت. منداڵەکان دەتوانن تا دەگەینە مەزڵ سەد جۆرە پرسیار بکەن. دەتوانن بە کەیفی دڵی خۆیان چەنەبازی بکەن. دەتوانن یەکتر ڕاوبنەنو تەنانەت بەردیش کۆ بکەنەوە. دەتوانن داوای گەنمە شامی یان مۆتاو دۆندرمە بکەن.

شادی نیگار بۆ ئەمیر دەکێشێت. شاهین چەند دێرێك دەنووسێتو من دوای سەلامو ئەحواڵپرسی، پەیامی خاوەن خانووەکەمانی بۆ دەنووسم.

"گرێبەستەکە تازە ناکەینەوە. خۆمان پێویستمان بە خانووەکەیە، دەبێ تا سەری مانگ چۆڵی بکەن".

دوای پازدە رۆژی دی ئەم خانووە ئیتر خانوو نیە، عەمارێکە تەژی کارتۆنانی پڕی لەسەر یەك هەڵچنراو. پڕە لە شتومەکی لۆك. فایدەی نیە. ژیان وەستاوە. دەبێ بە دووی خانوودا بگەڕێم. دەبێ لێرە باربکەین.

ئەمیر ناتوانێ واز لە کارەکەی بێنێ‌و بێتەوە. منداڵەکان دەبێ بێنەڕێوە.

"دایکە ماندوو بووم."

ڕێکردن باشە. هەمیشە هەر باش بووە. هەمیشە هەر بە کەڵکە.

کاتێ کە هەژاریت و کرێی تاکسی گرانە. کاتێ کە دەوڵەمەندی و چەوری لە شت بەرێکردن دەتوێتەوە، ئەگەر بتەوێ بیر بکەیەوە دەتوانی ڕێ بکەی. ئەگەر بشتەوێ خۆت لە بیرکردنەوە بدزیتەوە، پێویستە ڕێ بکەی.

بۆ ئەوەی لە قەرەباڵغی جادەو شەقامەکاندا هەست بە ژیان بکەی دەبێ ڕێ بکەی‌و بۆ لە بیربردنی ئازارو بێ میهری خەڵکیش، هەر دەبێ ڕێ بکەی. کاتێ گەنجی. کاتێ پیری. کاتێ منداڵیت. هەر وەستان‌و هەڵوەستەیەك یانی شتێکی خۆش، و بۆ وەستان‌و هەڵوەستەی دواتر دەبێ ڕێ بکەی.

منداڵەکان لە پێش منەوە ڕێدەکەن. کە ماندوو دەبن، دوا دەکەون. کاتێ هەر سێکمان خۆشحاڵین دەست دەنێو دەستی یەکتر ڕێدەکەین.

باوکە گیان هەمیشە لە پێشەوە دەڕۆیی. دایکم دەگەڵ منداڵەکاندا دوا دەکەوت. شەهلا منی پەلکێش دەکردو مهین دوور لە هەموومان



دەیویست هێدی هێدی ڕێ بکات. هەڵبەزێتەوە. تەمەشا بکات. پشتی چاکەتەکەی باوکە گیان تاقە نیشانەی من بوو. دەترسام ئەگەر چاوی لێ بگوازمەوە ون ببم.

لێ ئەمیر میناکی ئەو نیە. حەز لە ڕێکردنی تەنیایی ناکات. حەزدەکات شان بە شانی بم تا لەیەك کاتدا دوو کار ئەنجام بدات. ئەمیر هەمیشە بە تیرێك نیشانە لە سەد نیشان دەگرێتەوە، یەك تیر بۆ یەك نیشان حەیفە. کاتێ کە نان دەخوات تەمەشای تەلەفزیۆنیش دەکات. کە دەچێ بۆ ماڵی کەسوکاری لەسەر ڕێگاوە چەند کارێکی دیکەش دەکات. ئاخۆ ئێستا چی دەکات؟

مازوخیەتەکەم سەری کردووە، بیانووی دەست کەوتووەو کەوتووەتە چەهچەهە، ئەمیر ئێستا شان بە شانی ژنێك لە شۆستەکانی باکۆدا، کە دەڵێت پان‌و خاوێنە، پیاسە دەکات. سەبردەکەم تا ئازاری توندی حەسوودی‌و بەغیلی وەکو تەزووی کارەبا بە سەرانسەری لەشمدا تێ بپەڕێت. سەر لە نوێ ئەو وێنەیەی کە دروستم کردووەو ئێستا ئەوەندە روون‌و رۆشنە کە لە راستی دەچێت، تەمەشا دەکەمەوە. هەتاوی باکۆ روناك‌و زۆرە، دارو درەختێن کەنار شەقامەکانی زۆر بەرزن.

لەمە زیاتر ناڕۆم. ئەو دیمەنە لە هەمان شوێندا ڕادەگرم تا تۆڵەی خۆم بستێنم‌و پەنا دەبەمە بەر باوترین جۆری تۆڵە. بەخەیاڵ پیاوێك لە تەنیشت خۆمەوە دەخولقێنم‌و باسی ئەو خانوو و ماڵانەی بۆ دەکەم کە دیتوومن. ئەو نووسینگانەی کە سەرم داون. کۆمەڵێك کارتی ڕەنگاو ڕەنگ لە گیرفانم دەردێنم‌و نیشانی دەدەم.

"ئەمانە هەموو کارتی ئاژانس‌و بنکەێن سوکنەیە".

کرێ خانوو فرِیوه، هیچ به دڵم نیه، چقاس گرانه. ئەمە جگە لەوەی کە دەبێ بۆ خانوویەك بگەڕێین لە قاتی خوارەوە بێ تا مندالّەکان بتوانن ڕاکەڕاك بکەن.

چەنەم گەرم بووەو تازە بۆم دەرکەوتووە کە دەکرێت دەربارەی شتێکی سواو ئەو هەمەوو چەنەبازیە بکەی. دەڕوانمە دەوروبەری خۆم. مندالّەکان دوا کەوتوون. هیچ هەوالّێك لە کابرای خەیاڵی نیە.

نائومێدانە بە خۆم دەڵێم ئەگەر ئەو لەو شەقامەی نزیکی میترۆکەداو دەگەڵ ژنێکدا چەند ساتێکی شادی بگوزەرێنێ هیچ هێزێك لە دنیادا ناتوانێ ئەو ساتەی لێ بشێوێنێ. مێشکم وەکو سوزگیەکی لێهاتووە کە کونەکانی شاش بوونو هزرو خەیالاّت بە تۆپەڵ لێوەی دەردێنو هێرش بۆ زەینم دێنن. ناتوانم بە ریز بیر لە یەك شت بکەمەوە. لە یەك کاتدا دەڕۆمو ناڕۆم. دەبورمو تۆڵە دەستێنم. رێدەکەمو دەوەستم. لە ئەنجامدا خەیاڵێك لە هەمەوو ئەوانی تر زاڵترو سەر سەخت ترە، خەیاڵی ژنو پیاوێکی ئاشق.

بەلاّم من فێری ئەوە بووم چۆن دەرەقەتی خەیاڵ بێم کە وەکو پەپوولە بە دەوروبەرما دەسوڕێتەوەو بە باڵی رەنگینەوە کە هەر ساتەی بە رەنگێ دەنوێنێ بە بەرچاومەوە دەخولێتەوە. بێ جوڵە دەوەستم تا لێم نزیك دەبێتەوە. سەبردەکەم تا نزیكو نزیکتر ببێتەوە. پاشان بە چاوانێکەوە کە تا نزیکی تیغەی کە پووم غل بوونەتەوە لە بەدەنی کوولە ئاسای ورد دەبمەوە.

گەڕانەکەم ئەنجامی دەبێت، لە ماڵی تازەداین.



چەند رۆژێك بوریوەو من هێشتا جێگەی دڵخوازی خۆم لە هەواری تازەدا نەدۆزیوەتەوە، هەمیشە ئەم کارە یەك دوو رۆژێکی دەبرد. جارێك لە یەکەم ساتدا دۆزیمەوە. لێ هەنووکە چەند رۆژێك تێپەڕیوەو هیچ سوچێکی ماڵەکەم لا ئاشنا نیە، هیچ سوچێکی میهرەبان نیە. لەم ژوورەوە دەچمە ئەو ژوور. شتێك دەگوازمەوە، جێگەکەی دەگۆڕمو وام دێتە بەرچاو خانووەکە لە جێی خۆیدا نیە.

ژووری نووستنەکە رێكو پێکە، تەختو ئاوێنەو کۆمەدی، دەمەوێ پشت بە بالیفەکەوە بدەم. ئەم کارە دەکەم، بەلاّم هەست دەکەم کە ناتوانم بیر لە ئەمیر بکەمەوە. لە باکۆ، لە ئایندە. ناتوانم بیر لە هیچ شتێك بکەمەوە. هەندێجار ئەم کارە، بێ چەندو چوون خەتای موبەقەکەیە کە بچووکەو هەندێ کاتیش خەتای ژوورەکەیە کە شوێنێکی بە تاڵی تیا نیە پشت بە دیوارەکانیەوە بدەی. هەندێجار خەتای تەوالێتەکەیە، کە دەنگی هەواکێشەکەی ترسناکە. هەر هەمەوو تاقی دەکەمەوە. سوچو قوژبنانی ماڵەکە تاقی دەکەمەوە. دەبێ شتێك بگۆڕدرێ.

شاهین ناتوانێ ئەو هەوەڵین نامەیەی کە ئەمیر بۆی ناردووە، بخوێنێتەوە. نامە بە دەست دوای من کەوتووەو من دەبێ خوێندنەوەکەی بۆ ڕاست بکەمەوە.

"ئاریمان نیە. ئاڕمانە".

شاهین وشەیەك دەخوێنێتەوەو من وشەیەك.

"ئامانج".

بە شاهین دەڵێم هەڵیگرێت بۆ دوایی.

"سەربەرزی".

وشەکانی ئەو وەکو بەردێکە کە لە پشتەوە بەر سەرم بکەوێ.

"هەوڵو کۆشش".

سەرم قورس بووە. لەسەر عاردەکەو لە ناوەندی ژووری دانیشتندا ڕادەکشێم. هەستدەکەم لە ناو چەرخو فەلەکێکدامو دەسوڕێمەوە. هەستدەکەم خەونەکەی من عەیبدارە. وەکو ئەو بلورە درز بردووەیە کە حەیفم دێ فڕێی بدەمە تەنەکەی خۆڵەکەوە، بەڵام دەزانم کە چیتر بە کەڵك نایەت. ئەو چەرخو فەلەکەی کە تیایدام ناتوانێ بۆ شوێنێکی دوورم بەرێت. دەسووڕێمەوەو دەسووڕێمەوەو هەر لە شوێنی یەکەمجارمم.

"چیتە دایکە؟"

دەڵێم "هیچ، با کەمێك ئیسراحەت بکەم هەڵدەستم".

بەڵام پڕ بە دڵ حەزدەکەم بڵێم "ڕەزای ئەم خانووە بمرێت".



# 37

تام هەیە. قەرار بوو دایکم بێت کەچی نەهاتووە. لاقی خراپ داویانەتە ژان. شەهلا چەند جارێك تەلەفۆن دەکات و دەڵێت کە پێویستە بچم بۆ لای دکتۆر. دەڵێت نەدەبوو بهێڵم ئەمیر بڕوات و لە باکۆدا بۆ خۆی بسوڕێتەوە و من لێرە بە دیار دوو منداڵەوە بمێنم. هیچ ناڵێم.

لە ئاخر و ئۆخری شەودا تایەکەم زیاد دەکات، بە دەنم گڕ دەگرێت. دایکم نەهاتووە. دەنگی تەلەفۆن بڕاوە. دەنگی زەنگی تەلەفۆن نایەت. شاهین و شادی بەدیارمەوە دانیشتوون. دەڵێم ناتوانم هەستم دەبێ خۆیان بڕۆن لە یەخچاڵەکە شتێك دەربێنن و بیخۆن. چاوانم دەنوقێنم. کە چاوم دەکەمەوە هەموو شوێنێك ڕێکخراوە. منداڵەکان، ماڵەکەیان کۆکردۆتەوەو ڕێکخستوە. شاهین خاولییەکی تەڕی هێناوەو دەیناتە سەر تەوێڵم. شادی خەریکە بە زۆر گۆرەوییەکانم دادەکەنێ. شاهین داوای لێدەکات واز لە گۆرەوییەکان بێنێ وپەرداخێ ئاو بێنێ. دەستە چکۆلەکانی ئەوان بەسەر بەدەنمەوە دەجولێن: زۆر بە ئەسپایی قسە دەگەڵ یەکدا دەکەن و خەمی ئەوەیانە بێدار نەبمەوە. دەلەرزم.

چووم بۆ سەر ئەستێڵێك كە ئاوی تیا نیە. دەڵێم من بۆ مەلە هاتووم ئەدی كوا ئاو، بۆ ئاو نیە. كۆمەڵێ ژنی قەڵەو بە تویێی ماێووە لە چوار دەوری مەلەگەكە دانیشتوون و وەڵامم نادەنەوە مەرایی ودەڵەچەیی بۆ یەكتر دەكەن و فڕێی دەدەنە ئەستێڵەكەوە، بنی ئەستێڵەكە لە مەراییدا لینج بووە. دنیا گەرمە. ڕێگەیەكی زۆرم بڕیوەو هاتووم گوایە لەم ئەستێڵەدا مەلە بكەم، دەمەوێ لەشم تەڕ بكەم، ئاو بە خۆمدا بكەم، یەك دڵۆپە ئاو نیە. ژنە قەڵەوەكان سەریان كز كردووەو بە بێدەنگی مەرایی یەكتر دەكەن. هاوار دەكەم ئاو. لێوەكانم وشك بوون. چاوان هەڵدێنم. مندالەكان چەند لێفەیەكیان پێدا داوم و لە خوار پێمەوە خەویان لێكەوتووە.



# 38

ئەمیر دەڵێت "زۆر قەڵەو بوویت، بوویت بە بوفالو (گاكێوی) حەزم لەو كیژە قەڵەمیانەیە كە باریك و زراڤ بەشەقامەكاندا دەڕۆن".

پێدەكەنم. دەست بەسەر پێستی بازوم دا دێنم. ناسك و نەرمە. بەگرتن نەرم و ناسكە. كاتێ دەستم لادەبەم هەستدەكەم پێستی كەرگەدەنم هەیە. پێستی ئەستووری كەرگەدەنێك كە جەزرەبە بە نەوازشت دەزانێ.

پێدەكەنم.

هاوسەری ئەگەر بەردەوام بێت، پێستی ژن دەست بە ئەستوور بوون دەكات. بە رواڵەت هەستیارو ناسكە بەلاّم ئەستوورە. ئەم ژنە نەدەبورێتەوەو نە لە هۆش دەچێت. نە شەوو ڕۆژ خەفەت دەخوات. نە چنگ بە زەویدا دەكات، نە شەوان بە برسێتی دەخەوێو نە دەیەوێ خوێنی كیژانی قەڵەمی بڕێژێت.

پێدەكەنم.

پێكەنینەكەم پێكەنینی تووڕەیی نیە. پێكەنینی خۆشحاڵییە. خۆشحاڵی شتێكە كە هەر ژنێك دەوڵەمەند دەكات، متمانە بە خۆ بوون.

بێدەنگییەکەم پتر زاتی وەبەر دەخات، بەڵام پێستی ئەستووری ئەویش ناسکتر بووە. بەرادەیەك کە قاقای شادمانی من پێستی بـەدەنی دەبـڕێو دەگاتە دڵی.

"بەچی پێدەکەنی گاحۆل؟"



## 39

ڕەنگە ورگم لە ئێستا گەورەتر بیێ. لەگینە بگەمە تەمەنی مهین لـە ئێستا گەورەتر بیێ. لەوەیە ڕۆژێ بـێ کـە لـە ئاوێنـەدا خۆمـان ببیـنین دڵمان بە خۆمان بسووتێ. لەوەیە ڕۆژێ لـە ڕۆژان مهـین ئیـدی نـەتوانێ چالاكو لەزگین بڕەقسێو لەوەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ئێستا بێ تاقـەت تـر ببمو بە چارەنووس بڵێم من تەسلیم بوومو هەر کارێکت پێ خۆشە بیکە.

لەبـــەر ئـــەوە شـــەهلا هـــانم دەدات، ناچـــارم دەکـــات بەشـــداری پیادەڕۆییەکانی مهین بکەم. چـونکە لەگینـە هـەموو ئـەم بەڵایانـەمان بەسەردا بێت. لە میانەی پیادەڕۆییە ناو بەناوەکانەوە بۆم دەردەکەوێ کـە ڕێکردنی شان بە شانی یەکتر نیگەرانی لە بنیادەم دەڕەوێنێتـەوە. دەڵـێم "لە گۆڕی بابی تەمەنو ورگ..." بە دەنگی بەرز بیر دەکەمەوە "ڕۆحمـان پێویستی بە هەوایە".

مهین بەرپەرچم دەداتەوە "بەڵام نەك هەوای ئێرە کە پیسە. ئالودەیـە، پڕ لە دەنگە دەنگ. دەزانی من حەزم لە چییە؟"

مهین حەزەکانی بە وتن ناڵێت، جێبـەجێیان دەکـات. ئێـستا دەسـتی ئاواڵاکردووەتەوە.

"هەوای پاك"

له جۆره سەمایەك دەچێت. دەستی له زەوی نزیك دەبێتەوە.

"زەوی پاكو باراناوی".

بازووەكانی بۆ پێشەوە دەكشێن.

"و پاسكیلێك".

ئێستا خەریكە پاسكیل سواری دەكات. منیش دواكەوتووم. كە منداڵیش بوو لەوە زیتەلێترو چەلەنگترو گورجو گۆڵتر بوو كە بەردەستی هەر كەسو ناكەسێك بكەوێ. فیزماڵكی دەدایەو بۆی دەردەچوو.

"خانمی وەرزشكار، ئەدی من؟"

"تۆم بۆچییە؟ من دڵدارێكم پێویستە".

پیاوێكی تۆكمەو زەلام بەلاماندا ڕەت دەبێت. بە ئەسپایی دەڵێم "وەرە ئەمەش دڵدار".

مهین دەڵێت من ژنێكم كە هیچ خەونێكم نیە و لەم ڕووەوە بەزەیی پێمدا دێتەوە. زۆرم بۆ بە داخە.

لێ من دەست هەڵگرنیم "ئەدی كامە؟"

و دەڕوانمە سەرو سیمای یەك بە یەكی پیاوانی ناو پاركەكە. لێ دڵدارەكەی مهین لە هیچ یەكێك لەم بنیادەمانە ناچێت. دڵدارەكەی ئەو نە قڕقێنە لێدەدا، نەخۆی دەخورێنێ، نە زەق زەق تەماشا دەكاتو نە جنێو دەدات. تەنیا شان بە شانی ئەو پاسكیل سواری دەكات. سەبردەكەم تا دڵدار (Darling) لە پاسكیلەكەی دادەبەزێت. خۆ ئەم پاسكیلانە هەر دەبێ لە شوێنێك بوەستن.

مهین دەڵێت "ئێستا بزەیەكم بە ڕوودا دەداتو دەپرسێت ئازیزەكەم ماندوو بوویت؟"



"لێ بە بۆچوونی من بزەیەك دەكاتو دەڵێت "عەزیزم بۆ شێو چیمان هەیە؟ ئەم دەنگەی كە دەیبیستی دەنگی دڵی دڵدارەكەی نیە. كەمێك نزمترە، هێواشتر، بە یارمەتیت، دەنگی ڕیخۆڵە بە تاڵەكانیەتی".

دوای شێوكردن، پێڵوەكانی دڵدار (Darling) قورس دەبێتو باوێشكێكی گەورە، بە ئەندازەی ئەو وێنانەی كە لە عیادەی دكتۆرێكی دانسازدا هەڵواسراون، دەدات. بیری دەخەمەوە كە باشی ئەم كارە ئەوەیە بیرت دەخاتەوە كە دڵدار (Darling) دانێكی كلۆری هەیە كە دەبێ خەرجیەكەی لە موچەی هەوەڵی مانگ دەربكەی.

مهین دەڵێت: داماو، تۆ گوێت لە دەنگی باوێشك دەبێو من لە سەدای مۆسیقای خۆشو ئارامی پاش شێو".

"بەڵام قاپەكان، قاپەكان ئازیزم، قاپەكان".

مهین دەڵێت: "دەمت داخە، بەدفەڕی حەسوود. شا بە تاقەتی ئەمیر. خوا بە دادی ئەمیرا بگات. هەموو شتێك لە تام دەردەكەی".

دەڵێم "دڵم پێت دەسووتێ، حەزناكەم لەسەر لافیتەی مەرگەكەت بنووسن جوانە مەرگی نامراد".

پێ هەڵدەگرێت "منیش دڵم بە تۆ دەسووتێت كە ژیان لەم سنوورەدا دەبینیو هەر ئەوەندەشت پێ دەبڕێت نەك زیاتر."

## 40

منداڵەکان دەخەوێنم. پشت بە دیوارەکەوە دەدەمو لاقەکانم ڕادەکێشم. دەڵێی نەك لە ماڵی شەهلا، بەڵکو لە سەفەرێکی دوورو درێژ گەڕاومەتەوە. پشتم دەیەشێتو مێشکم جەنجاڵە. هیچ کارێکم لە دەست نایەت جگە لە گەڕانەوەو ژیانی دووبارە لەگەڵ ئەواندا.

پەڕۆکانی شادی دەگۆڕم. شەهلا چاوی لە دەستمە تا بزانێ کە ئاخۆ ئاوەچۆڕم کردوون. بە دوای شاهیندا دەڕوات و ڕژاوو پژاوی سەر فەرشەکە بە دەست کۆدەکاتەوە.

منداڵەکان لەلای خۆمەوە دادەنشێنم تاسەر مێزو تەپڵەکەکان لەکەدار نەکەن. بەناو لەپ لە دەرکە نەدەن. دەست لە تەلەفۆنەکە نەدەن. بە چەقۆو قاپو ئامانەکان تەقو هۆڕ نەکەن. شادی حەزدەکات بەسەر موبیلەکاندا ڕێ بکاتو هەموو جارێ پەردەکانی سەریان لا دەدات. عەردی سافو لوسی موبەقەکە، شاهین دێنێتە سەر زەوقو دەیەوێ خۆی لەسەری بخزێنێ.

دەمەوێ لە دروستکردنی خواردندا یارمەتی دایکمو شەهلا بدەم. دەڵێن باشتر وایە ئاگام لە منداڵەکانم بێت کە خەراپکاری نەکەن. لە



کاتی فراڤیندا هەر بیرم لای ئەوەیە کە مراکی ماستەکە لەسەر سفرەکە دانەن. برنج بڵاونەکەنەوە. پەرداخەکان توند بە دەستیانەوە بگرن.

دایکم دەڵێت: "منداڵەکان بنووێنە، با چاوێ گەرم بکەین". سەرینێ دێنێو بە منداڵەکان دەڵێت بێدەنگ بن دەنا پیاوێك لەم خوارەوەیە کە دێت دەرزییان لێدەدا. منداڵەکان خەویان لێ ناکەوێ. دەیانەوێ ڕێگە بکەن. شادی دەچێتە ژێر موبێلەکەوە. شاهین بێ تاقەت بووەو نووکە نووك دەکات.

هەنووکە لە ماڵەوەم. بەخۆم دەڵێم تا منداڵەکان گەورە دەبن هەر لێرە دەمێنمەوە بۆ هیچ شوێنێ بار ناکەم. لەنێو ئەم چوار دیوارەدا دەمێنینەوە. بە سێ قۆڵی. ئێژی یەکەم جارمە کە ڕووبەڕووی واقیعی ژیانی خۆم دەبمەوە. دەڵێی تەنیا ئەمشەو توانای ئەوەم پەیدا کردووە کە زاراوەێن بێهودەی میناکی ژیانی هاوبەشو کوانگی گەرمی ماڵو دەردو قوزەڵقورتو زەهری مار تورِ بدەمو زاراوەو چەمکی تایبەتی خۆم دابهێنم. ئەمە ژیانی منەو ئەم دوو منداڵە تەنیا هی منن. هەنووکە تەنیا خۆم بەرپرسم لەوەی کە چۆن درێژە بە ژیان بدەم. دوای گوشاری ئازارێکی قورس، فرمێسکەکانم دەسڕم. هەست دەکەم بە هێز بووم. ورەم بەرز بووەتەوە.

## 41

مهین، شادی بە سینگی خۆیەوە دەچەسپێنێو قیژەی لێ هەڵدەستێنێ. ئەوسا هەڵدەستێو گەمەیان لەگەڵ دەکات. شەهلا پێدەکەنێ "ورچە زل".

دایکە دەڕوانێتە مهینو چاوەکانی تەژی رونـدك دەبن. مهین، چەند رۆژێکە گۆرانی دەڵێ. شت دەکڕێت. بە ئینگلیزی قسان دەکات. نامە دەنووسێت. لیستی ئەو شتانە ئامادە دەکات کە پێویستە لەگەڵ خۆیی بەرێت، هەنووکە رووی کردووەتە منداڵەکان.

"ئەم فیڕنە گولانە چیان گەرەکە پوریێ لە هەندەرانەوە بۆیان بنێرێ؟"

شاهین دەڵێت "تفەنگ".

شادی دەڵێت "منیش تفەنگ."

شاهین بە پەلە دەڵێت "لاسایی کردنەوە کاری مەیموونە، مەیموونیش حەیوانە."

مهین، سەر دەخاتە سەر شەهلا.

"خێرا بڵێ، شامپۆ، سابون. کرێم، دەرمانی دان، عەترو...".

"پێویست ناکا، خۆم دەکڕم. ئێرانیەکانی باشترن."

مهین دەڵێت "خۆ تۆ دڵت نایە پارە خەرج بکەی گەداخانم".



دایکم دەڵێت "شوکور پارەشی هەیە".

شەهلا پێدەکەنێ "دامناوە بۆ رۆژی تەنگانە."

مهین کەپووی کرژ دەکات.

"رۆژی تەنگانە چ رۆژێکە".

"رۆژێکی ناخۆشی هەورە. لەوەیە لەم رۆژەدا کەسێك بمرێت"

دایکە لە بن لێوانەوە دەڵێت "خەرجی کفنو دفنی خۆمم هەیە دایە"

مهین دەنگی هەڵدەبڕێ "ئەگەر کەسێك لەو رۆژەدا بمرێت، ئەوە ناکاتە رۆژی تەنگانە. دەکاتە رۆژی تازیەو پرسە. دەشێت پێمان بفەرمووی لە رۆژی تازیەدا پارە چ سوودێکی دەبێ؟"

"لەوە رۆژێك بێت، کە تەنیا پارە رێ لە پێشهاتێك بگرێت. نازانم، دەبێ رۆژێك بێت کە من بتوانم چاوپۆشی لە پاشەکەوتەکەم بکەم. چونکە ئیدی سبەینێیەکی بە دوادا نایەت کە نیگەرانی بم".

شاهین، داواکەی گۆڕیوە.

"تفەنگم ناوێ. بەلەمێکی بایەوانیم دەوێ".

مهین، بە شێوازی خۆی برۆکانی وێك دێنێتەوەو کارێك دەکات کە دەموزاری بچکۆلەو جوان بێ.

"ئەدی تۆ گوڵەخانم؟"

شادی دەڕوانێتە شاهین. شاهین پێدەکەنێ. دەزانێ کە شادی نازانێ بەلەمی بایەوانی (بائاژۆ)چیە.. شادی پەنجە کەڵەی لە زاری دەردێنێو پێدەکەنێ

"میزڵدان".

هەموو پێدەکەنن. مهین تەمەشای من دەکات.

دەڵێم "هیچ".

"زۆر بە جددی گرتووتە. دە شتێ بڵێ".

شاهین خۆی بە ملما هەڵدەواسێ "دایکە شتێك بڵێ".

سەرم داخستووە. بیر دەکەمەوە چ شتێکم گەرەکە. نازانم. دەخوازم شتێك بڵێم. حەزدەکەم پێ بکەنم. سەرم بەرز دەکەمەوە "نامە". لێوم دەگەزم. دەزانم سەری کەپووم سوور بووەتەوە. مهین دێتە نزیکترە. منو شاهین پێکەوە لە هەمێز دەگرێتو لە هۆڕژنی گریان دەدا.



## 42

نامەیەکی ئاشقانەی رۆمانسی لە ئەمیرەوە هاتووە. نووسیویەتی کاتێ بنیادەم لە ماڵو حاڵی خۆی دوور دەکەوێتەوە هەنگێ قەدری ئەو شتانە دەزانێ کە هەیەتی.

نووسیویەتی تازە خەریکە قەدری من دەزانێو بیری ماڵو منداڵەکان دەکاتو ئەمە کردوویەتی کارێك نەتوانێ وەکو رۆژانی هەوەڵ کار بکاتو کە زستانیش بێت، ئیدی کار سوودی نیە.

نووسیویەتی زۆربەی کات بە تەنیایە. هاوسێکەیان هەندێجار دەعوەتی دەکات بۆ ماڵەوە —خەڵکانێکی یەجگار میوانپەروەرن- کیژەکەی پیانۆی بۆ لێدەداو ئەویش لەو کاتانەدا منی بیر دەکەوێتەوە.

شەهلا دەڵێت "چاوانی ئەمیر دووربینن. تەنیا لە دوورەوە دەبینن، کە دێتە نزیکەوە.."

دەڵێم "هەموو شتێك تاریکە."

"نەخێر هەموو شتێك روونو روناکە. بەڵام ئەمیر کوێرە".

شەهلا چاوەڕوانە پشتیوانی لێبکەم. ناچار دەبم زاکیرەی خاینم بە دیوارەکەدا بکێشم. پێویستە هەموو شتێك وەبیر خۆم بێنمەوە. ئەو هەموو رەنجە، ئەو هەموو قارو تۆرانە، ئەو هەموو نەفرەتە لە کوێیە؟

لێ زاکیرەم کاری سیحربازان دەکات. هەموو ئەوانە غەیب بوونو من خەجاڵەتی ئەوەم، کە ئارەزوو دەکەم شەهلا هەرچی زووترە بڕوات تا من نامەکە بخوێنمەوەو بخوێنمەوە.



## 43

باسی ئوتۆبانو ئەپارتمانە تازە روستکراوەکە بۆ ئەمیر نانووسم. باسی ئەو سۆپەرمارکێتەی بۆ نانووسم، کە لە سەرەتاوە، مشتەرییەکانی خۆی تاراندووە. باسی خۆمو دنیای دەوروبەری خۆمی بۆ دەنووسم. باسی هەموو کونو قوژبنێکی ماڵە تازەکەمانی بۆ دەنووسم. باسی خاوەن خانووەکەی بۆ دەنووسم،و باسی شاهینو شادی بۆ دەنووسم کە گەورەترو خۆشتر دەبن.

دەنگی شادی لە هەموو شوێنێکی خانووەکەوە دێت. قسە دەکات، شیعر دەخوێنێ، چیرۆك دەڵێت. کە بۆ تەوالێتیش دەڕوات، دەنگی گۆرانی دێت.. بەدەم دەست شۆردنەوە گۆرانی دەڵێت.

شاهین دەڵێت کە ئەو پیاوی ماڵەو دەبێ هەمووان بە قسەی بکەن. کلاوە زستانیەکەی ئەمیر لەسەر دەنێ، قەمسەڵەکەی ئەو لەبەر دەکاتو بە ژوورەکەدا دێو دەڕوات. شادی حیلکە حیلك پێدەکەنێ.

"دەستور دەدەم".

روو دەکاتە منو نازانێ چ دەستوورێك بدات. قامکی بە حەواوە ڕاگرتووە.

"دەستوور دەدەم کە".

شادیش هاو دەنگی دەكاتو ئەویش دەستور دەدات. كۆمەڵێك دەستووری نادیار بەسەر سەرمەوە لەمۆلەق وەستاون. شاهین هاوار دەكات. ئەنجام دەستورەكەی دەدۆزێتەوە.

"دەستور دەدەم پێبكەنی".

ناكرێ دەستورێك كە بەم هەموو زەحمەتە دراوە، لە عاردی بدرێ. پێدەكەنم. پاشان بۆ جێبەجێكردنی دەستورێكی دی هەڵدەستمو یەكتر ڕاو دەنەینو یاری دەكەین. شەو لە فریشتەیەك دەچم كە وەزیرە ئەمەكدارەكانم لە هەردوو لامەوە خەوتوون.

درێژە بەنامەكەم دەدەم. دەنووسم حاڵمان باشەو واچاكە ئەویش وەكو منداڵان بیانوو نەگرێت، خۆی نەدزێتەوە. تا كۆتایی زستان بمێنێتەوەو كارەكەی بگەیەنێتە سەر.



## 44

دایكی شەهلا دەڵێت: "پیاو نابێ ژنو منداڵە چكۆلەكانی بە تەنێ بەجێ بێڵێو بڕوات".

لێ دایكی من دەڵێت: "پیاو تا دوور تر بێ، ژن ئیسراحەت ترە."

دایكی شەهلا دەڵێت: "ژنێك كە مووچە یان دەرامەتێكی هەبێ پێویستی بە مێرد نیە."

لێ دایكی من دەڵێت: "ژن هیچی نەبێ، بەڵام ناوی مێردی بە سەرەوە بێ".

مهین بۆمان دەنووسێت ئێمەیان لە جیاتی ئەو كوڕانەی كە نەهاتنە دنیا گەورەكردو لە نێو ئێمەدا شەهلا لە هەموو زیاتر بووە قوربانی. نەبوو بە ژنو نە بوو بە پیاو. بوو بە نێرەموك.

دایكی شەهلا تێشت ناخوات.

"ئیشتیام نیە."

وەك یەكێك قەناعەت بە خۆی بكات دەڵێت:

"تێشتی تێرو تەسەل بۆ من باش نیە".

لێ دایكی من پاش ڕۆییشتنی هەمووان، هەوەڵجار خوتەخوتەكەی، دەقاو دەق وەكو رادێویەك كە لە پڕ بیكوژێننەوە، دەبڕێت. ئەوجا سفرە ڕادەخات. چای دەم دەدات. بیری لای ئەوەیە كە خۆش رەنگو بەتام بێت، و

تامی ئاوی حەمام نەدات. مرەباو کاکڵە گوێزو پەنیر لە قاپی جیاجیا دەکاتو بە دەم تەمەشاکردنی چۆلەکەی پشت پەنجەرەکەوە تێشتەکەی دەخوات.

دایکی شەهلا ژنێکی بێ ئەقڵە، گەیبووەتە ئەم تەمەنەو تاقە پولێکی پاشەوکەوت نەکردووە. دایکی من پاشەکەوتێکی ئەوتۆی هەیە کە هیچ کەسێك نازانێ برەکەی چەندە، هەندێجار کە کەس دیار نەبێ، هەندێ عەسران کە دڵی دەگیرێت دەری دێنێ، چەندین جار دەیان ژمێرێتو دەیان ژمێرێتەوەو هەر بەستەیەکیان بە کشتەکێکی ئەستوور دەبەستێ.

دایکی شەهلا ژنێکی پیرەو بیر لەو دنیا دەکاتەوە، لێ دایکی من تازە کەلکەڵەی ئەم دنیایەی کەوتووەتە سەر.

دایکی شەهلا ژنێکە کە هەموو جۆرە بەدبەختیو نەگبەتیەکی تەحەمول کردووەو تاسەر وەفاداری مێردەکەی بوو، لێ دایکی من ئەوەندەی وەفاداری خۆی بوو، وەفاداری کەسی تر نەبوو.

کاتێ شەهلا باسی دایك دەکات من بە بێدەنگی گوێ دەگرم. ئەو ژنەی کە شەهلا باسی دەکات تەنیا دایکی خۆیەتی.

دەستی بە بەر چاوانم دا دەجوڵێنێو چەقەنەیەك لێدەدا.

"لە کوێی؟"

دەڵێم: "لای مهین. بیری دەکەم".

ناڵێم کە چوو بوومە لای مهینو خەریك بووم باسی ئەو دایکەم بۆ دەکرد کە دەمناسی.



# 45

دەنووسم مهین گیان، دایکە نەخۆشە. قەرارە شەهلا سبەینێ ئەنجامی فەحسەکانی وەربگرێتەوە. بە هەرحاڵ پێی وایە هەقە دایکە پارێز بکات، کێشی خۆی دابەزێنێ.

دایکە بە ئەسپایی دەڵێت: "دەیەوێ لە برسا بمکوژێت".

دایکە بۆ چەند رۆژێك دێنمە ماڵی خۆم. دراوسێکان دێنە دیدەنی. ئەمیر جواب دەنێرێ "پێی ئەم دراوسێیانە بۆ ئەم خانووە مەکەنەوە".

دایکە دەڵێت "کوڕی وەزیریش بە ئەندازەی مێردەکەی تۆ بە فیزو دەعیە نیە".

دایکە دەگری، دەناڵێنێو دەستی دەخاتە سەر سینگی.

"ئێرەم دێشێت. زۆریش دێشێت".

پورە مەحبوبم بیردەکەوێتەوە. ئەویش دەستی دەخستە سەر دڵیو دەیگوت دێشێت. چاك لە بیرمە کە دەستی لەوێندەر نەدەهاتە خوارێ، دەستی لەوێوە بەرەو میدالەکەی دەڕۆییو لە چاڵی سینەیدا جێگیری دەکرد. دەستێکی بە ملیدا دێناو دەی پرسی "تۆ دەزانی چۆن ئەم وردە خاڵانە لادەبرێن؟"

ئەو تایبەتمەندییەکی هەبوو کە دایکە نیەتی. دایکە لە مەعدەنی ئەو نیە.

دەڵێت: "ناکا دڵم وەکو مەحبوب بوەستێ".

لە فکران ڕادەچێت.

نازانم بیر لە مردنی پورە مەحبوب دەکاتەوە، یان لە مەرگی خۆی.

"فایدەی چیە ئەگەر وەکو قەدیر بمێنم".

دراوسێکان تا حەوت نیوەشەو گوێیان لە دەنگی گریانو ناڵەی هاپۆ قەدیر دەبوو، کە مەحبوبی گاز دەکرد.

"یان وەکو ئەو ڕەحمەتیە."

دەپرسم ڕەحمەت بۆ کام یەك لە مردووەکان دەنێرێ.

"مەحبوب. خوشکە بێچارەکەم. وەختی مردنی نەبوو."

لەوەیە ڕەحمەتی دووەمیش بنێرێ. دەنگ ناکات. هیچ کەسێك لێرە نیە تا خۆی بنوێنێ. تەنیا منو ئەوین. وەکو ئەو شەوەی کە منو دایکە بێدار بووین. تۆ لە ماڵ نەبوویت. شەهلا نووستبوو.

لەبەر تریفەی مانگەکەدا دەمبینی کە ئەو بێدارەو گوێم لە دەنگێك دەبوو. دەنگی باوکە گیان لە ژێر زەمینەکەوە دەهات. فریادی کۆمەك نەبوو لێ دەنگی بنیادەمێك بوو کە دەپاڕایەوەو داوای شتێکی دەکردو لە کپیو بێدەنگی شەوەکەدا باش دەبیسترا. چەنێك بەو دەقەوە مامەوە، نازانم. پڕ بە دڵ حەزم دەکرد دەنگی ناڵەو زاریەکە نەمێنێ، ببڕێ. سەرم خستە ژێر لێفەکەمەوە، لێ دەنگی ناڵەکە هەر دەهات. سەبرم کرد تا دایکە هەستێ، لێ بەو دەقەوە ڕاکشا بوو و گوێی دەگرت.

دەنگەکە، دەنگی گریان بوو. دەنگی پاڕانەوەو کڕوزانەوە بوو. دەنگی دەردو ئازار بوو. نیوە ئاخێزێکم کردو لە دایکم نزیك کەوتمەوە. چاوانی نوقا بوون. لێ من دەمزانی بە خەبەرە. پرشنگی چاوانیم بینی بوو. گازم



کرد. وەڵامی نەدایەوە. دەمویست بچمە خوارەوە لێ زاتم نەدەکرد، پێم وا بوو خەیاڵێکەو تەواو دەبێت. خەوێکەو لە بیر دەچێتەوە. هەموو شتێك تەواو دەبێت. هەر ئێستا تەواو دەبێت. لێ تەواو نەبوو.

شانی دایکەم ڕاتەکاند، پشتی تێکردمو ناڵاندی. دەترسام شەهلا خەبەر بکەمەوە. ئەگەر تێر خەو نەبوایە، خەوی بزڕایە تا چەند ڕۆژێك مجێزی دەشێواو نەدەهاتەوە تایم. لە نێو جێگەکەمدا ڕۆنیشتم.

دەزانی مهین، چەندین ساڵە، لە تۆڵەی ئەو شەوەدا، هەموو شەوێك بە خەیاڵ سەرینەکەم توڕ دەدەم. بە تاقی تەنیا بۆ ژێر زەمینەکە دەڕۆم. گڵۆپەکە هەڵدەکەمو لەلای باوکە گیان دادەنیشم.

لەو ساوە تا ئێستاشی پێوەبێ نەمتوانیوە ڕاکشێمو سەرم بخەمە ژێر بالیفەکەم. ئەمە وێنەیەکە لەو دەیان وێنانەی کە بە هیچ جۆرێ ناتوانم خۆمم تیای خۆش بوێ، وەك بڵێی ناکرێ بەبێ خۆشەویستی لە شتێك بپەڕیتەوە. من لەو بەری وێنەکان ماومەتەوە. لەوبەری تارماییو سێبەرەکانو خاوەنی هەمووشیانم. چۆن دەکرێ بەم بارە قورسەوە بۆ شوێنێك بڕۆیت.

باوکە گیان هەمان شەو مرد. بە تاقی تەنیاو میناکی منداڵێکی بێ پەنا.

ناتوانم درێژە بە نووسینەکەم بدەم. نامەکە قەدو نوشت دەکەمو دەیخەمە ژێر تەختەکەم.

## 46

شوێنی دڵخوازی خۆم لە ماڵەکەدا دۆزیوەتەوە. لە هەمان شوێن دانیشتووم‌و خەریکم بەرپەڕێن کتێبێک هەڵدەدەمەوە. هەموو جارێ دەگەڕێمەوە سەری دێڕو سەر لە نوێ ڕستەکە دەخوێنمەوە. چاوانم وەکو موگناتیسێکی لێهاتووە کە وزەی کێشکردنی خۆی لە دەست دابێت، بەبێ ئەوەی توانای کێشکردنی وشەکانیان هەبێ بەسەر کاغەزەکەدا دەخزێن. سەرم دەنێمە سەر کتێبەکەو کاتێ سەر هەڵدەبڕم ئەمیر هاتووەتەوە، بێ هیچ خەبەرو ئاگادارییەک. ناسینەوەی زەحمەتە. کەمێک ڕەش هەڵگەڕاوە، کەمێک لاواز بووە، کەمێک غەریبە.

منداڵەکان ماچ دەکات‌و دەڵێت بڕۆن لە حەوشە یاری بکەن. دەڵێم "نا، با نەڕۆن. لە حەوشە دەنگە دەنگ دەگەن."

ئەمجۆرە تەنیاییە هیچ جۆرە لێکچوونێکی دەگەڵ ئەوەی لە فیلماندا ڕوو دەدات نیە. نە دەنگێ نە ئاهەنگێ. وەکو ژن‌و پیاوێکمان لێهاتووە کە لە جادەدا تووشی یەک بووین‌و قەرارە بیرمان بکەوێتەوە کە نزیکی‌و پەیوەندییەکمان دەگەڵ یەکدا هەیە. بەڵام تەنیا بیر کەوتنەوەو زاکیرە بەس نیە. شتێکی دیکەشی دەوێ کە لەگینە ئەو شتە کاری دڵ بێ.

ئەمیر لێم نزیک دەبێتەوەو باسکم دەگرێت.

دەڵێم "با بڕۆم چایەکت بۆ بێنم."

تا موبەقەکە بە دوومدا دێت. دەستم بەر نادات "ئیتر بۆ باکۆ ناگەڕێمەوە. لێرە دەمێنمەوە."



## 47

دایکم دەڵێت: "سوێند بخۆ کە بە هیچ کەس نەڵێی."

شەهلا خەریکە کەمپوتی بۆ هەڵدەپچڕێ.

"دەخوازم کاتێ کە قسە دەکەم هەمووتان تەماشای دەموچاوم بکەن."

پێدەکەنم "تەماشای کەپووت".

بە دەم ناڵینەوە دەڵێت "ئەرێ، بەڵام نەک تەمەشای سینگم"

چاو دەبڕمە دەموچاوی تا سەیری سینگی نەکەم. دەمو چاوی پیر بووە.

"بێ شانسی منە کە دکتۆرەکە خراپ عەمەلیاتی کردووە، سینگ دەبێ ساف‌و لوس بێ. تەنانەت ئەگەر مەمکیشی پێوە نەبێت. ئەم وردە چرچ‌و لۆچە عەزابم دەدات. دەبێ ساف‌و لوس بێ. وەکو پێویستی لەشی ئینسان".

بینی پێیەکانم دەخورێ. هەروەها سەری پەنجەکانم.

شەهلا بۆ شت کڕین دەڕواتە دەرێ.

"بەڵام ساف نیە. هەندێجار لە کەللەم دەدا ئوتویەکی گەرمی پێدا بێنم‌و سافی بکەم."

دەناڵێنێ.

"ئازارت هەیە؟"

چاوەڕوانم شوێنی ئازارەکەم نیشان بدات. ئاماژە بۆ سینگی دەکەم. دەڵێت "نە".

دەستی بە حەوادا بۆ شوێنی ئازارەکە دەگێڕێ. نازانێ بە تەواوەتی لە کوێدایە. لەوەشە هەر لە بنی ئازاری نەبێ. وەك بڵێی هزرم بخوێنێتەوە، بە دەنگی بەرز دەناڵێنێ. ئەم ناڵەو زاریە دەناسم. وەکو پیرە دایەنێك دەگەڵیا ڕاهاتووم. کۆنە. لە کۆنی دا، ساف نیە. گیراوو گڕە.

لێ درۆیە. دەگەڵ ئەم دەنگەدا ڕانەهاتووم. خووم پێوە نەگرتووە. حەزناکەم دایکم بناڵێنێ. ناڕازیم. دەزانم تەوێڵم پڕە لە چرچ و لۆچ، گرژە، و بەهیچ جۆرێ لە پەرستارانی خۆشڕەفتارو رووخۆش و لێو بەخەندە ناچم. دایکەش ناڕازییە. نەخۆشی، هیچ ئارامی و ئاسودەییەکی بەسەر و سیمای نەبەخشیوە.

" ئەگەر مهین لێرە بوایە تەگبیرێکی دەکردم."

نازانم مهین دەیتوانی چ تەگبیرێکی بکات کە من و شەهلا ناتوانین بیکەین. نەخشی گریانێکی کاڵ نیشتووەتە سەر رووی. شیری بۆ دێنم و دەوروبەری چەرچەفەکەی ڕێك دەخەمەوە. دەرمانەکانی بۆ لە قاپێکدا هەڵدەچنم و بۆ چەندەمین جار چۆنیەتی خواردنی دەرمانەکانی بیر دەخەمەوە. هەر هەموو ئەمانەم لەبەر ئەوەیە کە هیچ کارێکی ترم لە دەست نایەت بۆی بکەم. کارێك کە هەموو نەخۆشێك پێوستی پێیەتی، دڵدانەوە. پێموایە من بە هیچ جۆرێ بەکەڵکی دڵدانەوە نایەم.



## 48

ناتوانم دڵی ئەمیرش بدەمەوە، مجامەلەی بکەم.

" هەرچەندە نەیتوانی خوێندن تەواو بکات، بەڵام ژیانی گۆڕا. تۆ بیری لێبکەوە، ئەگەر لێرە بمایە ژنێکی عەوامی بێ سیواتی میناکی هەزار ژنی دیکە دەردەچوو. بەڵام ئێستا...".

ئەمیر کەوتووەتە یادی دۆستەکانی و دەگەڵ هەر ڕستەیەکی دا نیگای من دەکات. چاوەڕوانە من شتێك بڵێم تا بە جۆش و خرۆشو دڵگەرمییەکی زیاترەوە باسی ئەو جیهانە بکات. ئەوەندەی بەسە بڵێم، مێردەکەی نەخۆش کەوت، دڵتەنگ و خەمبار بوو.

هەنگێ زۆر بە ئارامی و بە شێوەیەکی قەناعەت بەخش دەست پێدەکات" دەزانم، ئەوانیش کێشەو گرفتی خۆیان هەیە، بەڵام نیگەرانی و ترس و دڵەڕاوکێی ئەوان دەگەڵ هی ئێمەدا جیاوازە." ئەوسا بەرە بەرە دەنگی بەرز دەبێتەوە " تۆ نازانی دۆزینەوەی.... لە پشت کارگاوە یانی چی؟ نازانی دیتنی کیژێکی سیازدە ساڵەی ئالودەو هەمەکارە چ کارێك لە ئینسان دەکات."

ئەمیر تەنیا پەلەپیتکەیەکی گەرەکە تا هەموو قسەکانی هەڵڕێژێت. بەکرێو بێ هیچ قسەیەك بۆ حەوشە چکۆڵەکەی پشتەوە دەڕۆم. دەنگی دەفەکە، ئەگەرچی درەنگ، بەڵام دەستی پێکردووە.

دەڵێت "ئەو دەرگایە داخە. ئەمشەو، تەنیا ئەمشەو گوێ لە ئورکستەری سەمفۆنی مەگرە. وەرە دانیشە".

لەلایەوە دادەنیشمو دەپرسم "خێرە، هیچ هەیە؟"

دەزانم شنەیەك لەو دیوەوە، بەرەو ئەم دنیایە هەڵیکردووە، وەکو دووکەڵی کەبابخانەیەك کە لە مەودایەکی دوورەوە بێتو پەرەی کەپوو بلەرزێنێ.

"گەرکتە چی بێ؟"

بازووەکانی وەکو دەستەکێك، بە هێمنی دەخاتە سەر چاوانی "تۆ لە ماڵەوەیتو ئاگات لەوە نیە چی  لە دەرەوە دەگوزەرێو ئەگەر بتزانیبا ئەم قسانەت نەدەکرد."

نازانم چ قسەیەلێکم کردووە.

"تۆ ئامادەی ئەگەر سەد جاری دی زندوو بیتەوە لە هەمان ژینگەی بۆگەنو پیس بژی، نا؟"

دەمەوێ هاوار بکەم، بەڵام حاڵەتی تاوانبارێکم هەیە کە ئیعترافکردن، یان نەکردنی هیچ کارێك لە حوکمی مەرگەکەی ناکات.

"باش بیری لێ بکەوە، تۆ بیر لەوە بکەوە، منداڵەکان دەرفەتی خوێندنی باشیان هەبێ. دەرفەتی ئەوەیان هەبێ سوود لە بەهرەو توانای خۆ وەربگرن. لەلایەن هیچ کەسێکەوە سوکایەتیان پێ نەکرێ".

ئەگەر بازووی لەسەر چاوانی لا ببات ئەوەندە لە کەسێك ناچێت کە کەوتبێتە ژێر دارو پەردووەوە.

هەڵدەستمو قاپەکانی شێوی ئێوارە دەشۆم. پێشکەکان لە ژوورەکە دەتارێنم. پەنجەرەکان دادەخەم. ئەمیر بە دەم ئەو چیرۆکەوە کە بۆ خۆی



گوتووە، خەوی لێکەوتووە. پەتۆیەکی پێدا دەدەمو بەواسواسەیەکی تازەوە دەرگاو پەنجەرەکە جووت دەکەم. دنیا فێنکەو تاكو تەرا پەنجەرەی ماڵەکانی بەرانبەرمان روناکن. فلچەی دانەکەی ئەمیر لە جێی خۆی دادەنەم. لێفەی منداڵەکان لەسەریان رێك دەخەم. تەماشایەکی دیکەی موبەقەکە دەکەم. هەموو شتێك لە جێی خۆیەتی، ڕێكو پێك. ڕادەکشێمو هەستدەکەم کە بێفایدەیە. قەپاتکردنی دەرگاو پەنجەرەکان فایدەی نیە. نا ئارامیو نیگەرانی وەکو پشیلەیەکی چەپەڵ خۆی بە ماڵەکەدا کردووەو دەزانم ئەگەر چاوانیش بنەمە سەر یەك، دەنگی پڕخەپڕخی شوومی لە خەویشدا دەژنەوم.

49

هاوار دەکەم.

"لەم ماڵەدا من هەقی ئەوەم نییە شتێکی تایبەتیم بۆ خۆ هەبێت؟"

ئەمیر بێدەنگە. پشت ملی سوور بووەتەوەو ئەمە نیشانەی خەراپییە.

دووبارە دەیکەم بە دادو بێداد. ئەمیر ئەو نامەیەی خوێندوەتەوە کە بۆ مهینم نووسیوە، و ئێستا وەکو شایەدێك کە هێشتا قازی داوای نەکردبێ، حازرو ئامادە دانیشتووە.

بۆ ئەوەی بیهێنمە قسان وەکو نشتەرێك کە لە دومەڵێکی نزیك بکەنەوە، بەسەریا دەقیژێنم.

دەڵێت "ئێستا دەزانم بۆچی هیچ کاتێك خۆشیم بە دایکتا نەچووە".

نازانم هەوەڵجار لەسەر نامەکە بە شەڕ بێم یان لەسەر بوچوونی ئەمیر دەربارەی دایکم. دەڵێم "هەقی ئەوەت نەبوو نامەکەم بخوێنیتەوە".

"با هەقم هەبوو. هەر شتێك لەم ماڵەدا پەیوەندی بە تۆوە هەبێت، پەیوەندی بە منیشەوە هەیە."

ئەو لایەنگری گشتیەتی هەموو شتێکە، مێشکی خۆم دەگوشم تا بیرم بکەوێتەوە کە چیم لە نامەکەدا نووسیوە.

"خەریکە باجی تاوانی خۆی دەدات"

بە سەرسامی سەیری دەکەم

"باجی چی و تاوانی چی؟"

"باجو تاوانی بێ رەحمی خۆی، بێ سوزی خۆی. جا بزانە چۆن چۆنی دەمرێت. سەد جار خراتر لەو پیاوە".



دەچێت بەلای یەخچاڵەکەوەو دەڵێت: "بێچارە".

دیسان ئەمیر وشەیەکی بێ داكو بابی فڕێ داوەو من دەبێ خاوەنەکەی بدۆزمەوە. لە دڵی خۆمدا دووبارەی دەکەمەوە بێچارە خۆت دایکە، بێچارە خۆت ئەمیر، بێچارە خۆت باوکە گیان. وشەکە وەکو کراسێك بە بەری یەك بە یەکی ئەو کەسانە دەگرمو تاقی دەکەمەوە. تیا ماوم کە ئەو کاڵایە لە باڵای کامیان زیاتر دێت.

لە پڕ چاو دەبڕمە بەرانبەرم "ناکا کاڵای باڵای خۆم بێ."

## 50

شەهلا باسی بێتاقەتی دایکە دەکاتو زۆری دەوێ تا دەگاتە باسی نەخۆشییەکەی. بەبێدەنگی گوێ دەگرمو یەجگار مژوڵم. بۆ هەر شوێنێ دەڕۆم دەست لە کار کردن هەڵناگرم. تەنانەت ئەو کاتەش کە چەرچەفو سەرجێیەکەی دایکە دەگۆڕم. یان ئەو کاتەی شادی بۆ قوتابخانە دەبەمو دێنمەوە.

یان کاتێ چاوانی خوێنگرتووی حوسەینی دەبینم. ئەمیر لاقی دەخاتە سەر لاقەکەی تریو دووبارە شوێنەکانیان دەگۆڕێت. هیچ کێشەیەکی دەگەڵ لاقەکانیدا نیە. کێشەی دەگەڵ بێدەنگی دایە. دەست بە قسە کردنی دەکات. هیچ گوێیەك قسەکانی ناگرێت. قسەکان ئاوساونو ژوورەکە پڕ دەکەن.

دەچمە ئەو ژوورەی کە مەنیجە لێی دانیشتووە. حاڵەتی ڕێبوارێکی هەیە کە بلیتەکەی گوم کردبێت. دەگەڵ خۆدا بۆ ئەو ژوورەی دێنم کە ئەمیرو حوسەینی لێی دانیشتوون.

ئەمیر بە نیگا ئاماژەم بۆ دەکات قسەیەك بکەم، لێ من لەوە گێل تر بووم کە لە ئاماژەکەی بگەم. ناچار دەبێت پەیامێکی ئاشکراترم بۆ بنێرێت.

"سەبرکە بزانە چۆن سەرو دڵت دەگرم."

کە سەرو دڵی بنیادەم بگیرێت، ئاشت بوونەوەی زۆر زەحمەتە.

ئەمیر دەکەوێتە ڕێ. مەنیجە لە پەنجەرەکەوە تەمەشام دەکات. دەستێکی بۆ بەرز دەکەمەوە ئەمیر وا خۆی دەنوێنێ کە نەی دیتووە. دەبێ



تا سەر شەقامەکە بەپیادە بڕۆین ئەوجا تەکسیمان دەست بکەوێ، بە نێو تاریکییەکەدا دەکەوینە ڕێو من دەست بە کاری خۆم دەکەم. وەکو جاڵجاڵۆکەیەك خێرا خێرا چوار دەوری خۆم دەتەنمو لە نێو ئەو جوڵاتەنەیەدا ڕێ دەکەم. ئەم تەونو داوە لە هەموو شتێك قایمترە. ئەمیر دەست بە قسان دەکاتو منیش خەریکم خێراو گورج وەکو ژنێك کە بە چاوی نوقاویشەوە دەتوانێ ئێلەکێك بچنێ، درێژە بە کاری خۆ دەدەمو لە دڵی خۆم دا دەڵێم.

"ئێستا ئەگەر دەتوانی سەرو دڵم بگرە".

## 51

**شەهلا بە دەستی پڕەوە دێتەوە.**

**"بۆچی بە تاریکی دانیشتوون؟"**

**هیچ نالێین. گلۆپەکە هەڵدەکاتو دایکە خێرا خێرا چاو دەتروکێنێ. پێموایە دایکە تەنیا یەك (چرا)ی هەیە هەرکە کوژایەوە، هەموو شوێنێ تاریك دەبێت. شەهلا لە چرایەك زیاتری هەیە. بۆیە تەنانەت کاتێ کە عەزادارەو شینو زاری دەکات دەتوانێت لە نێوان ڕوندكو هاواریشەوە بە کچۆڵەیەك کە بە پێوەیە بڵێت فلاّن خانم چای لە بەردەم نیە، یان کلینیکس بێنەو با شەکردانەکان پڕ بن.**

**ئەمیریش چرای زۆرە. کاتێ چرای ماڵەوە کوژاوەتەوە دەتوانێ چراکانی دەرەوە هەڵبکات. بۆیە کاتێ کە لە من دەتۆرێ دەکارێت بۆ حەوزو ئەستێلان بڕوات. بەیانی سەروپێ بخوات. خۆی دەعوەتی شەربەتێکی فێنکی میوە بکاتو دەگەڵ هاوڕێکانیا بداتە دەشتو کێوان.**

**منیش میناکی دایکە هەر یەك چرام هەیە. کاتێ دەکوژێتەوە دەروونم دەبێ بە تاریکستانی موتڵەق. کاتێ کە لە هەموو دنیا دەتۆرێم، لە هەموو کەس زیاتر لە خۆم تۆراوم.**



**لێ مهین چرای زۆرتری هەیە. چراکانی ئەو هەمیشە لە حاڵی هەڵبوونو کوژانەوەدان. ئەگەر چەند چرایەکی خامۆش بن گرینگ نیە. چونکە هێشتا چەند دانەیەکی تری روناکە.**

**لە دەوری ئەو بەستانەی کە مهین ناردوونی، خڕدەبینەوە. من نامەکەی دەکەمەوەو شەهلا بە چەقۆ تیێپی کارتۆنەکە دەبڕێت.**

**مهین نووسیویەتی هەنووکە دەگەڵ گەنجێکی ئەمریکایی خۆش مەحشەر ومەشرەفدا دەژی. وێنەکەی لە بەینی بەستەی جلەکاندایە. هیچ کێشەیەکیان نیە، تەنیا هەندێجار لە زمانی یەکدی حاڵی نابن. مهین هیچ شتێکی دەربارەی مێردە ئێرانیەکەی نەنووسیوە. چێدەچێ تەنیا چەند هەیڤێك پێکڤە ژیابن. باسی ئەو کرێمو بۆدرانەی کە ناردوونی، بۆ نووسیوین. چەند دێڕێك دەخوێنمەوەو چاوم لە دایکەو شەهلایە کە بەستەکانیان هەڵڕشتووەو هەنووکە لە بەستەیەك، کە پێدەچێ تایبەتی بێ و روکاون.**

**مهین نووسیویەتی باشترین مەمکدانە کە دەستی کەوتووە. نووسیویەتی تۆزێك بچووکنو بۆ مەمکی دایکە نابێت کە ئەوەندە گەورەن بێ ترس پیاڵە چایان لەسەر دابنێ.**

**دایکە جنێوی رۆمانسیانەی پێدەدات.**

**شەهلا دەڵێت "ئەم درێژ داهۆڵەی لە کوێ دۆزیوەتەوە؟".**

**وێنەکەی لە دەست وەردەگرمو سەیری دەکەم. درێژ داهۆڵ پێدەکەنێ. لە دوو ڕەگ دەچێت، و مهینی وەکو جووجەڵە گرتووەتە ژێر باڵی خۆی. وێنەکە دەستاو دەست دەکات. بەستە تایبەتیەکە دەستاو دەست دەکات. نامەکە دەستاو دەست دەکات.**

وێنەکە دیسان دێتەوە لای من. بە دوو قامکم بەدەنی درێژ داهۆڵ دادەپۆشم. جارێکی تر سەیری مهین دەکەمەوە، قژی بژو ڕەش کردووە، باسکی رووتەو پانتۆڵەکەی تەسکە. وێنەکە دێنمە پێشیٚو دەبەمە دواوە.

دایکە بە سەر سامی تەماشام دەکات "خوشکەکەت ناناسیتەوە؟"



## 52

حەزم لە ژێر زەمینەکەیە. هەندێجار حەزدەکەم بۆ ئەوێندەر بگەڕێمەوە. هەندێجار تاقە جێگایە کە بشێت بۆی بڕۆی. لە مێژە بۆم بە دیار کەوتووە کە هەمیشە ژێر زەمینێکم لەگەڵ خۆدا هەڵگرتووە، لەوەتای ئەوەم کەشف کردووە، کە ئەوێندەر شوێنی یەکەمینی منە، زۆر سەری ئەویٚ دەدەم. ئەم چەلە زاتم پەیدا کردووە کە تیادا ڕیٚ بکەمو بە وردی تەمەشای دیوارەکانی بکەم. تەنانەت لێبڕاوم گڵۆپێك بە بن میچە نزمەکەیەوە هەڵواسم. ژێر زەمینەکە ئێستا نامترسێنیٚ. دەمەویٚ بۆ ئەوێندەر بڕۆم. ئەمجارەیان بە چاوانی کراوەو بەبیٚ ترس.

سیو پێنج دانە ساڵ کرێچی ئەم شوێنە بوومو ئێستا هەست دەکەم من خاوەنیم. دەمەویٚ لەکونو کەلەبەرو دالآنەکانی بە ئاگا بم. دەمەویٚ قاڵدرمەکانی بە باشی ببینم. ڕێگاکانی دەرەوەو ناوەوەی بناسمو لە نزیکەوە تەمەشای خەڵکەکانی بکەم. هەمیشە بە تاریکی تەمەشام کردووەو تەنیا تاپۆو تارماییانم تێدا دیتووە. ئاخر چۆن دەمتوانی، لە کاتێکا کە ترس چاوانی کوێر دەکردمو بێزاری هەناسەی لەبەر دەبڕیم، جگە لە تاپۆو تارماییان شتێکی دیکە بدینم.

هەنووکە دەمەوێ لەبەر ڕۆشنایی چرادا هەر هەموو کونجو کەلەبەرەکانی بدینمو بناسم. منداڵەکان گازم دەکەن. زەنگی تەلەفۆنەکە لێدەدا. شادی قەڵەمتەراشێکم (قەڵەمدادەر) دەخاتە ناو دەستو بە زەحمەت لەوێوە دێمە سەرێ. تەکانێ دەدەمە خۆ. هیچ پەلەیەکم نیە، خەریکم داواکاری منداڵەکان جێبەجێ دەکەم. دەزانم هەر کاتێ مەیلم لێ بێ، دەتوانم بۆ ئەوێندەر بگەڕێمەوە، وەکو ڕێبوارێك کە بۆ زاگەی خۆی دەگەڕێتەوە.



# 53

ژنە دەچێتە ژووری نووستنەکەوەو پیاوەکە دوای عوزرخوایی لە سەرووی شانی ژنەکەوە تەمەشای ناو ژوورەکە دەکات. بۆ تەمەشای حەمامەکە عوزرخواییەکی دیکە دەکات. کابرای دەڵاڵ چاوێك لە ئەمیر دادەگرێت. دەنگی دەفەکە بەرز دەبێتەوە. ژنو پیاوەکە تەمەشای یەکدی دەکەن. کابرای دەڵاڵ دەڵێت "ئەمە چییە؟"

لە دوای ژنو پیاوەکەوە وەدەردەکەوێ. ئەمیر دووی کابرای دەڵاڵ دەکەوێو دوای چەند دەقیقەیەك دەزفڕێتەوە.

منداڵەکان نیگایەکی ئەو دەکەنو نیگایەکی من کە ئامادەی ڕۆییشتن دەبم. ئەمیر لەبەر موبەقەکەدا وەستاوەو لە جەنگاوەرێك دەچێت کە باوەڕ ناکات حەریفەکەی بەبێ دەنگ ملی ڕێگا بگرێو مەیدان چۆڵ بکات.

لە دەرگا دەچمە دەرێ. هێشتا لە نێو حەوشەکەدام کە شادی لە شوشەی پەنجەرەکە دەدات. بە جوڵەی لچو لێویدا تێدەگەم کە چەند جارێك دەڵێت پفەك "کولیچە".

بە پێیان دەڕۆم. لە چوار ڕیانەکە ڕەت دەبمو بە کۆڵانێکی چۆڵدا تێدەپەڕم. ئەم کۆڵانە لە کۆڵانەکانی تری ئەم شەقامە ناچێت. دارو

درەختی هەیەو بۆنێکی خۆشی لێدێ. بۆنی یاس، بۆنی گوڵەباخ، بۆنی برنجی تازە دەم کێشاو. پەنجەرەی ماڵەکان گەورەن‌و ئاوێزەکانیان لە پشت پەردە تۆرییەکانەوە دیارە.

"کەسێك کە باڵندەکەی لە شوێنێ بفڕێت‌و بڕوات، زەحمەتە بتوانێ لە هەمان شوێن وەمێنێ. لە ماڵەکەی خۆشیا هەست بە غوربەت دەکات".

ئایا منیش باڵندەیەکم هەیە؟ باڵندەی خۆم، چما دەشێت کە سێك هەبێ باڵندەی خۆی نەبێت. ئەم جەعفەر ئەشقیەش، کە بە عەینەکە ئەستورەکەیەوەو بە کاکۆڵە لوولەکەیەوە لەسەر شەقامەکە وەستاوە، باڵندەی هەیە. ئەوەتا خەریکە لە بن لێوانەوە فیکە لێدەدا، بێگومان بۆ باڵندەکەیەتی.



***تێبینی:***

**لە رۆژی 29/5/2011، سەعات دوانزەی نیوەڕۆ لە سلێمانی، گەڕەکی رزگاری لە پاچڤەی ئەم رۆمانە بوومەوە کە لەم سەرچاوەیەوە کراوە بە کوردی:**

**پرنده من /فریباوفی – تهران : نشر مرکز، چاپ چهارم 1383(2004)**

## حەمە کەریم عارف

* کەرکووکییە و لە ساڵی 1951دا لەدایك بووە.

• لە ساڵی 1975 کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.

• یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (170) رۆژنامەی هاوکاری لە 8/6/1973 بڵاوبووەتەوە.

• لە ساڵی 1975ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.

• سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد ، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە 222، گۆڤاری نەوشەفەق.

* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك،نووسەری کوردستان، کەلتوور، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: 222 بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح.ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.

*لە ساڵی 1974 – 1975دا پێشمەرگەی شۆڕشی کوردستان بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی



کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە رۆڵەی میللەتی مەزلۆم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.

• لە هەشتاکانەوە تا 20/8/2010ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.

• زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لەوانە:

1- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم 1979
2- کۆچی سوور، رۆمان، چاپی یەکەم،1988 ،چاپی سێیەم 2007
3- بەیداخ، چیرۆك، چاپی یەکەم 1988
4- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك ،چاپی دووەم 2005
5- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك،چاپی یەکەم (1999) دەزگای گوڵان
6- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێڕان چاپی یەکەم 1987 شاخ
7- نینا، رۆمان، سابت رەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،1985 چاپی سێیەم 2005
8- نامۆ، رۆمان، ئەلبیر کامۆ، چاپی یەکەم، شاخ1987چاپی چوارەم 2009 وەشانخانەی سایە ،سلێمانی

9- ڕێبەر، ڕۆمان، مەهدی حسین، چاپی یەکەم (شاخ) 1983، چاپی دووەم، 2007

10-شکست، ڕۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راه کارگر)، چاپی دووەم، 2009 خانەی وەرگێڕان.

11- هاوماڵەکان، ڕۆمان، ئەحمەد مەحمود، چاپی دووەم 2000 دەزگای گوڵان

12 – بێناسنامەکان، ڕۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم 2006

13- قوربانی، ڕۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم 2004 دەزگای شەفەق

14- دووره وڵات، ڕۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم2000 دەزگای گوڵان

15- ئازادی یا مەرگ، ڕۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم 2003 کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: 2008

16- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، چاپی دووەم، 2004 کتێبخانەی سۆران هەولێر

17- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ 1985

18- ئەو ڕۆژەی کە ونبووم (کۆمەڵە چیرۆکی بیانی) چاپی یەکەم،2006

19- جێ پێ (کۆمەڵە چیرۆکی فارسی) چاپی یەکەم 2006،نووسەرانی کەرکوک

20- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆك، چیخۆف،چ1 ،دەزگای موکریانی

21- چیرۆکستان ،کۆمەڵێك دەقورەخنەی جیهانی چ1 ،2005،نووسەرانی کەرکوك

22-دیدارو دەق و ڕەخنە ،چ1،2005

23-دیداری چیرۆکڤانی، چ1،2005

24-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ ،چ1،2008نووسەرانی کەرکوك

25- میوان، چیرۆك،ئەلبێر کامۆ

---

26- مەسەلەی کورد لە عێراقدا ،عەزیز شەریف،چاپی دووەم 2005

27- مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد ، ئیحسان نوری پاشا ،چ1،19981

28- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم 2004

29- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم 2006

30- کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەمدا ،کریس کۆچرا ،چاپی چوارەم 2007

31 –کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا ،چاپی یەکەم 1998

32- چینی کۆن، چ1 ( )دەزگای موکریانی

---

33- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی

34- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

35- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر
36- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:12)
37- جولەکەکەی مالّتا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.
38- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ
39- بەد حالّی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
40- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولآم حسەینی ساعیدی)
41- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.چاپی یەکەم 2009، بلاوەخانەی سایە، سلێمانی
42- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوللائەلبوسێری..

43- مندالّە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ مندالآن.
44- فاشیزم چییە؟ کۆمەلّە چیرۆك بۆ مندالآن، یەلماز گونای
45- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ مندالآن
46- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ منالآن)
47- چەند چیرۆکێك لە ئەفسانەی یونانی کۆنەوە (23ئەفسانە)

48- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)چاپی یەکەم2008
49- ئەفسانەیێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (2004) کتێبخانەی سۆران، هەولێر
50- ئیلیادە، هۆمیرۆس، چ1 ،دەزگای سەردەم 2009



51- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی – کوردی) حەمە کەریم عارف، چ1(2006-2008)دەزگای موکریانی
52-چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چ1، 2001

53- چرنیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس
54- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.
55- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
56- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی
57- گوگول، نووسەری ریالیست
58- یەلّماز گونای، ژیان و بەرهەمی
59- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی
60- خافروغ لە شیعر دەدوێ، ژیان و بەرهەمی

61- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەلآتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (2001) دەزگای گولآن
62-راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەلّەتێنی دا، حەمە کەریم عارف،چ(1)،2005

63- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).چاپی یەکەم2008
64- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم2008

65- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمان- ئەمریکاو ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم2008

66- ریالیزم‌ودژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا ،سیروس پرهام،چ1،2004 ،دەزگای سپیرێز

67- قوتابخانە ئەدەبییەکان،رەزا سەید حسەینی، چ1،2006 دەزگای موکریانی

68- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی

69- لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆ ، لویس ریی ،چ2، 2006

70- هونەروژیانی کۆمەلایەتی، بلیخانۆف، چ1(2005)دەزگای موکریانی

71- گوزارشتی مۆسیقا،د. فواد زکریا، چ1،یانەی قەڵەم 2006

72- ڕێبازە هونەرییەکانی جیهان

73- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ1) 2006

74- دەربارەی شیعروشاعیری، حەمە کەریم عارف، چ1،2007

75- دەربارەی رۆمانو چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ1 ، 2008

76- مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدەبی- رۆشنبیری،حەمەکەریم عارف،چ1 ، 2005نووسەرانی کەرکوك

77- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ1) دەزگای موکریانی،2009

78- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف،چاپی یەکەم()

79- پەلکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ1 ، 2004



80- خیانەتی حەلاڵ، حەمە کەریم عارف

81-بووکی هەزار زاوا، کۆچیرۆك، بزورگی عەلەوی

82-ئەبوزەر، د.عەلی شەریعەتی

83-ریوایەت، ڕۆمان، بزورگی عەلەوی

84-وقفات في رحاب الثقافة الكوردية، حەمە کەریم عارف

85-هەژاران، ڕۆمان، دوستوفسکی

86-دەیڤد کۆپەرفیلد، (ڕۆمانی کورتکراوە بۆ نەوجەوانان) چارلس دیکنز

87-ئۆدیسە، داستان، هۆمیرۆس

88-ظل الصوت و قصص اخرى، تقديم و ترجمة جلال زنطابادى

89-شازادە و گەدا، رۆمان، مارك توین

90-بۆ کوێ دەڕۆیت؟

91-سفرەی فەقیران حەمە کەریم عارف

92-باڵندەکەی من ڕۆمان، فریبا وفی

* لە راپەڕینەوە تا نهوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات وبەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بلاودەکاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بلاو کردنەوەی هەبن، دەبێ پرس بە نووسەر بکات...

